

هاشم كاكەیی

# مێژووی بزووتنەوەی بابی و بەهاییەکان



هەولێر ٢٠١٢



وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتیی راگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر

**ناوی کتێب:** مێژووی بزووتنەوەی بابی و بەهاییەکان

**نووسینی:** هاشم عاصی کاکەیی

**پیتچنین:** سەنگەر هاشم

**نەخشەسازی ناوەڕۆك:** ئەنجام سعید بابان

**نەخشەسازی بەرگ:** ئامانج ئەمین

**چاپی یەکەم،** بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی رۆشنبیری - هەولێر/ ٢٠١٢

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**
**ژمارەی سپاردنی (٧٨٩) ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە**

هەندێ جار کە موتالاّی کتێبە مێژووییەکانم دەکرد، جارجار چاوم دەکەوتە زاراوەی (بابییە و بەهائییە) یاخود سەرەداوێك لە مێژووی بزوتنەوەی (بابییە – بابیی) وسەرهەڵدانی، نەم دەزانی ئەمانە کێن وخەڵکی کوێن و بیرو باوەڕیان دەبێ چۆن بێت و هەگبەی (باب) دەبێ چی تێدابووبێ و لە چی دوابێ ، هەروەها پەیوەندی ئەم گرۆیە چی بێ لە گەڵ ئیسماعیلیەی فاتمی و بیروباوەڕە باتنی یەکانی وەك (هەقەو ئەهلی هەق ودروزو نوسەیری) و پاشان فەلەیان وجولەکە و زەردەشتی. لە راستیدا بەندە بەسەرهاتی باب و ئەو ئافرەتە ناودارەیان (قرە العین)وچۆنیەتی سەرکوت کردنی بزاڤەکەیان و ئەنفال کردنیان کە سەرچاوە ئێرانییەکان خۆیان دان بەم راستیەدا دەنێن، سەرنجی راکێشام و پێم باش بوو لەم جۆرە بابەتە بە زمانی کوردی لە مەڕ ئەم بیروباوەڕەوە بنووسم و سەرچاوەکانیش بەراوورد بکەم و بەلای راستیەکاندا بڕۆم.

لێکۆڵەران راو بۆچوونی جودایان هەیە سەبارەت بە پەیدا بوونی ئەم بیروباوەڕە نهێنی یەی بابیەو سەرهەڵدانی و پێناسە کردنی، هەیانە وتوویە : ئەمانە گرۆیەکن لە گرۆیانی شیعە و هەندێکیشیان لەو باوەڕەدا بوونە کە ئەمانە لە نێوان شیعەو

سوننەدا بوون، کەچی هەندێکیش وتوویانە: ئەمانە ئاینێکی نوێیان پەیدا کردوە. دیارە ئەم لێکدانەوەیەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو رەنگاو رەنگییەی لەم ئایین و باوەڕەدا بەرجەستە بووە و دێتە پێش چاو کاتێك دەچیتە ناوەڕۆکیەوە. کەسانێکیش هەن لەمێژووی سەرهەڵدانی ئەم تایەفەیە دوو دڵن و مێژووی سەرهەڵدان و بزاڤەکە گەلەك بە کۆنتر دەدەنە قەڵەم بە تایبەتی سەرچاوە مێژووییە ئێرانییەکان، کەچی ئێرانییەکان دەڵێن نەخێر ئەمانە بە هۆی (میرزا محەمەد عەلی)و (میرزا حوسێن عەلی) نازناو بە (بەهاء)ی کوڕی میرزا بزورگی نوری مازندەرانی سەریان هەڵداوە، هەمووشمان دەزانین وڵاتی ئێران لانکی سەرهەڵدانی ئەم جۆرە گروپانەیە کە یەکێك لەوانە بابییە و پاشان بەهائیەیە کە لە مێژوودا گۆشەیەکی تایبەت و دیار داگیر دەکەن. لەبەر ئەوە دەتوانیین بڵێین ئێران هەر لە زووەوە مەڵبەندێکی بەرفراوانی دەرکەوتنی ئایین و رێبازو رێڕەوە هەمە جۆرەکان بووە، بە ناوبانگ ترین ئایینیشی زەردەشتی بووە کە ئایینی خەڵکانی (ئاریان ڤاج: واچ)بووە بە گشتی ، هیچ بە دووری نازانم کە بیروباوەڕی بابییە لە بنەڕەتدا سەر بە ئاینێکی کۆنی ئێران بێت، بەڵام لە سەردەمی( باب) جارێکی دی زیندوو کرابێتەوە هەر وەك دەیان رێبازو رێڕەوی دی رۆژهەڵات، چونکە

لە تێڕوانینی موسڵمانانی عەرەب بۆ ئەم بیروباوەڕەی بابییە، دەخرێتە چوار چێوەی (شعوبییەت)وە، ئەگەر بێت و مرۆڤایەتیش سەرهەڵدانی ئەم جۆرە بزوتنەوانەی کەلە مێژووی عەرەبدا ناوی نراوە شعوبییەت بە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی و شارستانی و فیکری دابنێ کە بڕێك لە نەتەوەکانی غەیرە عەرەب وەك کورد و فارس پێی هەستاون لەسەر دەمێکدا بۆ گێڕانەوەی مافە زەوت کراوەکانیان لە ناوچەکانی خۆیاندا، ئەوا رەنگە تەرازوی هەق هاوسەنگ بێ، چونکە وادیارە دەسەڵاتدارانی ئومەوی زۆر لە بنەماکانی موسڵمانان دوور کەوتبوونەوەو بەچاوێکی نزم روانیویانەتە موسڵمانی غەیرە عەرەب و ئەم بزوتنەوانەشیان بە گوزارشت کردن لە دەمارگیری فارسەکان لەقەڵەم داوە دژی عەرەب. سەیریش لەوەدایە شعوبییەت تەنها فارس وکوردی نەگرتوەتەوە کە خەریکی سەرهەڵدان بووبن ، بەڵکو رەگەزەکانی وەك (نەبەطی و قبطي و ئەندەلوس و زوط لە خەڵکانی سندو زنجەکان) لە ئەفریقیای دەگرتەوە .ئەم بزوتنەوەیشە لە نیوەی دووەمی سەدەی یەکەمی کۆچی دەستی پێکردووە و بەردەوام بووە تا دەمی عەباسییەکان کە بە هۆی (ئەبو موسلم خۆراسانی) یەوە پەیدا بوون ، خەڵکە داخ لە دڵەکەیش بوونە پاڵپشتی ئەبو موسلم چونکە ئومەوییەکان

ئەگەر مۆری قورقوشمیان لەگەردنی موسڵمانی ناعەرەب نابێ و ناوی شوێنو زەوییەکانیان لەسەر گەردنی جوتیاری (ئەهلی زیمە – اهل الذمة) کان نووسیبێ بۆ ئەوەی لە باجدان رانەکەن ، ئیتر چۆن سەرهەڵدان دەست پێ نەکات. شایانی باسە کوردەکان بەشداری بزوتنەوەی بابەکی خوڕەمییان کردوە بە هۆی (عصبة الكردى) خاوەنی ناوچەی (مرند)و هۆزەکانی کوردی ئازەربایجان و ئەوانەی لە پشت قەوقازەوە بوون (١).

زۆر کەس لە مێژوونوسان وای بۆ چوونە کە بیروباوەڕی شیعەگەری (التشيع) دەگەڕێتەوە بۆ بنەڕتێکی فارسەکان ، ئێرانیەکان پادشاکانی خۆیانیان وا دەهاتە پێش چاو ، کە ئەوان لە نەوەی خواکانی دنیان و هەر لەم روانگەیەوە تەماشای عەلی (س.خ.)و نەوەکانی ئەویان دەکرد ، لەبەر ئەوە ملکەچییان بۆ ئیمامان ملکەچییەکی (رەهایە = مطلق)ە ، هەروەها فارسەکان لە ژێر کاریگەری بیروباوەڕی هیندی‌یەکاندا بوونە پێش موسڵمان بوونیان ، شاکانی خۆیانیان بە بەرجەستە بوونی روحی خودا دەدایە قەڵەم کە ئەم روحەیش لە ناو نەوەکانی شاکان دا دۆنای دۆن دەکات لە باوکەوە بۆ کوڕەکەی و ئەمانە لە نورن (٢).

## بیرۆکەی مەهەدی لە ئایینەکاندا:

لە زۆربەی ئایینـەکانی رۆژهەڵاتـدا وا بـاوە بـە پەیـدا بـوونی (رزگارکارێـك) لـە کاتێکـدا خـەڵکان لـە رێگـای راسـت لا دەدەن و دەکەونـە نێـو بارێـك لە بیرکردنـی ئـایین و کەوتنـە نێـو تـاوان و بـەڵاو تووشـبوونیان بـە دەسـتی فـەرمانڕەوایانی زاڵـم و نـەمانی عەدالەت وحەق کردنـە نـا حـەق لـەم جۆرە بابەتانـە کـە دەبێتـە مایەی سەر هەڵدانی زاتێك بە نێوی (مەهەدی — رزگارکـار)و ئـەم گەلانەش چاوەڕێی دەرکەوتنی ئەوزاتـەن لـە ئێستا و بانـەرۆژ بـۆ رزگـار بوونیـان لـەو نەهامەتیانـەی بـە دەسـیەوە دەنـاڵێنن و تووشـیان بـووە لـەم رۆژگـارەدا. پێغەمبـەرانی یـەهودییان مـژدەی ئـەوەیان داوە بـە پەیـدا بـوونی رزگـار کارێـك کـە خـوا رەوانـەی دەکات بۆ لادانی خـەڵکان لـەگوناه و تاوانـەکانیان و رزگـار کردنـی یـەهودییان و هـەموو خـەڵکان لـە زوڵـم و زۆرێـك. ئـەوان واتـە یـەهودییان لـەفزی مەسـیح بـەکار دێـنن بـۆ مەهـەدی چـاوەروانکراویان کـە لـە نـەوەی داود پەیـدا دەبـێ ولـە زوڵـم و زۆرداری و چەوسانەوە رزگاریان دەکات و هەموویان کۆدەکاتەوە و دەوڵـەتی خـوایی — دەوڵـەتی یـەهودی گـشتگیر پێکـەوە دەنـێ و پایتەختەکەی (ئورشەلیم - قـودس) دەبـێ. هەنوکـەش زۆرێـك لـە فەلـەیان لـەو بـاوەڕەدان کـە مەسـیح نـەمرەو جـارێکی تـریش

دەگەڕێتەوە بۆ دادپەروەری سەپاندن لە سەر زەوی کە گیرۆدەی زوڵم و ناداد پەروەرییە و خەڵکانیش لە دەستی زوڵم زۆرداری دەستی مرۆڤە دڵڕەقەکان رزگار دەکات (٣)

وادیارە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەی زاینی خەڵکان چاوەڕوانی دەرکەوتنی حەزرەتی مەسیح بوون,واتە گەڕانەوەی جاری دووەمی ,لەناو گرۆیانی موسڵمانیش بووەتە مقۆمقۆی دەرکەوتنی ساحیبی زەمان: حەزرەتی مەهدی , واپێدەچێ موسڵمان و فەلەیان لەو باوەڕدا بوون کە لەم سەدەیەدا سەردەمێکی رۆحی نوێ دێتە ئاراوە هەر وەکو چۆن لە کتێبە پیرۆزەکاندا پێشبینی ئەم روداوانە کراوە.کۆمەڵگەی ئێرانیش بەدەستی چەندین گرفت و کێشەی کۆمەلأیەتی و ئابووری و سیاسیەوە دەینالأند ,لەم کاتەدابوو مژدەدەر(سەید محەمەد عەلی) کە لاوێکی بازرگان بوو,رابگەێنێ کە ئەو حەزرەتی (باب)ە, واتە خاوەنی پەیامێکی ئاسمانییەو دەتوانێ رۆحانیەتی ئادەمیزادەکان سەرلە نوێ بنیات بنێتەوە,لەبەر ئەمە دەبینین بەناوی خواییەوە دەدوێ ((یا أهل الارض اسمعوا نداء الله.. لقد جاءکم النورمن الله بکتاب هذا علی الحق بالحق مبینا لتهتدوا الی سبل السلام)). هەروەها بەلای بەهاییەکانەوە ئەم دەرکەوتنە خواییەی باب هەموو مرۆڤەکان چاوەڕوانی بوون و دەرگایەك بوو

بۆ دەرکەوتنی نێردراوی دووەم کە باب مژدەی پەیدابوونی لە کتێبی (البیان) دابوو بە (من یظهره الله) کە گوایە مەبەستی (باب) لە (بەهائولا)یە کە لەپاشان دینێکی سەربەخۆی جیاواز لە دینی بابیە پێکەوە نا بەناوی (بەهایی)، چونکە بەهاییەکان لەو بڕوایەدان ئەوەی دەردەکەوێتەوە پاشیی باب، ئەو کەسە پایەی لە باب بەرزترەو هەلگری پەیامێکی نوێیە لە یەکسانی و دادپەروەری و ئاشتی و مرۆڤایەتی کە لە هەگبەی ئەم زاتەدا رێنمایەکان هەن و رێڕەوی مرۆڤ بەرەو ئاراستەیەکی گرنگ دەبات. بۆ ئەم مەبەستە باب پەیڕەوانی خۆی ئاگادار کردوە بۆ چاوەڕوانی کردن و دەرکەوتنی ئەو کەسەی کەخۆی بۆیان دەردەخات،دەبێ هەمووگوێڕایەڵ و بڕوای پێ بهێنن.لەمبارەیەوە (بەهاییان) پێیان وایە رۆڵی باب هەروەکو رۆڵی (یوحەننای مەعمەدان)بووە،کە مژدەی دەرکەوتنی بەهائولای راگەیاندوە،،یانی رێگای خۆشکردوە بۆ دەرکەوتنی بەهائولا، بۆیە دەڵێن دروست بوونی ئایینی بابی لە راستیدا مرادف دروست بوونی بەهاییە.

ئینجا ئەوەی زیاتر سەرنج راکێشە لەم بابەتەی دەرکەوتنی (مەهدی)یە ئەوەیە، لای هەندێك گەلان و گروپ ئەو زاتە یا ئیمامە، یان پێغەمبەرە، یا ئەوەی یەکێك لە پێغەمبەرانە. کەچی لای هەندێ ئایینی تر بریتیە لە دەرکەوتنی زاتی خوا خۆی

(صـــاحێب کـــەرەم)، (صـــاحێب کـــار) و دیـــوان گرتنـــی و بەرقـەراربوونی عەدالـەتی راستەقینە و پاش بـە سـزا گەیانـدنی تاوانباران و سەرکەوتنی حەق بەسەر نـا حەقدا و پێکەوە ژیـانی ئاشـتیانەی مرۆڤـەکان و گیـان لـە بـەر و پێکـەوە ئـاو خـواردنی مـەڕوگورگ. کەسـێتی ئیمـامی (مەهـدی چـاوەڕوانکراو) کـە بـە ئیمـامی دوانزەیـەم دەزانـرێ لـە بـیری ئـایینی سیاسـی ڕێبـازی شیعەیانی ئیمامیی دوازدەییدا، بیرو باوەڕێکی چەسپیوو نەگۆڕە و گرنگی و تایبەتی خۆی هەیەو ئەمان باوەڕیـان وایـە کـە(مەهـدی) پێـشوای دوانزەیـەم و کـوڕی پێـشەوای یازنزەیـەم (حەسـەنی عەسکەری)یە، بەڵام شیعەیانی زەیـدی و ئیـسماعیلی بـەو جۆرەی نـابینن کـە موحەممـەدی کـوڕی حەسـەنی عەسـکەری کـە گوایـە دەوروبەری ساڵی ٢٥٥ ك لە دایك بووە و لە تەمـەنی پێـنج سـاڵیدا لـە دەسـتی ئەشکەنجەو راوە دونـانی عەباسیەکاندا ون بـووە ولـە کۆتایی دونیادا دەردەکەوێتەوە.(٤)

لەبــەر ئــەوە دەبیــنین بیرۆکــەی مەهــدی و پەیــدابوونی پانتاییەکی فراوانی لە لاپـەڕەکانی مێـژوودا داگیرکـردوە چەندین شـۆرش و بزافـی ئـایینی سـەری هەڵـداوە لـە چـەندین ناوچـەی جیاجیـای وڵاتانـدا، هـەموو ئـەم بزوتنەوانـەش پـەنایان بردوەتـە سەر ئەو مەسەلەیەی دەرکەوتنی ئیمامی مەهدی (س.خ.)، یـاخود

بەکار هێنانی ناوی ئیمامی مەهدی بۆ پشت ئەستوور کردنی شۆڕشەکەیان، یەکێك لەوانەیش ئیسماعیلیەکانن کە بە بناغەدانەری ئەم بیرۆکەیە دێنە ئەژمارو بزوتنەوەی بابییەش دەبەنەوە سەر هەمان رێڕەوی ئیسماعیلیە. زانیارییەکانی (ئیسماعیلیە)یش بریتین لە تێکەڵاوبوونی جۆرەها مەزهەوو ئایین و بیروڕای سیاسی و کۆمەڵایەتی جیاوازو بنەماکانی فەلسەفەو زانستە هەمە چەشنەکان ، رێبازەکەشیان زیاتر لە سەر پیرۆزی ژمارە (٧) بنیات نراوە کە پیرۆز بووە لە وڵاتانی رۆژهەڵاتدا ، هەروەها پەنابردنە بەر فەلسەفەی (یونانی)و (مانی)و لێکدانەوەکانی باتنی (٥).

هەروەها وتوویانە (ئیسماعیلیە) هۆنراوەیەکی فەلسەفییانەیە بە گوێرەی زەمەن پێشدەکەوێ و خۆی لە گەڵیا رادێنێ ، بە واتایەکی تر واتە : دەرپەڕینی بیری راپەڕیوانەیە لەم دونیای بێ سنوورە ، یاخود بازدانی روحە بەرەو نموونەی باڵای ، ئەم حاڵەتەیش دەریایەکی مەنگی زانیارییە وگڕێکی پرشنگدارەو تیشکێکی روناکەرەوەی شەوە زەنگی دونیای خولقاندن ولە ناوچوونە. هەروەها ئیسماعیلیە ئەو لوغزو مەتەڵەیە کە شیکار کردنی گرانەو ئەو دەرگایەیە کە کلیلی بەردەست نەکەوتووە، دەریایەکی مەنگەو خەزینەیەکی سەرداپۆشراوە، تیۆرێکی

فەلسەفی یە و بیرۆکەیەکی مرۆڤایەتییە، لەو رۆژەوە دنیا دروست بووە ئەم هاوشانی هاتووە ، ئیسماعیلیە بە شێوەیەکی گشتی بە ئاینەکەیان دەڵێن (الدعوة الهادية المهدية)، زۆری پێ نەچوو بەرەو سستی چوو ، بوە دوو بەشەوە بە هۆی کۆچکردنی خەلیفەی هەشتەمی فاتمی (المستنصر بالله) ساڵی (٤٨٧ ك /١٠٩٤م)، یەکەمیان نزارییەکان بوون کە بوونە لایەنگری کوڕی خەلیفەکەیان (نزاری کوڕی ئەلموستەنسربیلا) هەر چەندە ژمارەشیان کەم بووە بەلاّم توانیویانە بە شام و قۆهستان وئەلەموت وئێران و ئەفغانەدا بلاّو ببنەوە پایەختەکەشیان(ئەلەموت) بووە. دەوڵەتەکەشیان لە لایەن هۆلاکۆ ٦٥٤ ك / ١٢٥٦ م هەڵوەشایەوە ، بەلاّم تا ئێستاش لەو شوێنانەو هیندستان و بەشێك لە عیراق دا هەن ، ئەمرۆش بە ناوی (ئاغا خانی)یەکان دەرکەوتوون کە بەشێکن لە نزاریان .

بەشی دووەمی ئیسماعیلیان کە زۆرینەن بە ناوەکانی (الاسماعيلية المستعلية - یان الطيبية)، یان(البهرة – واته بازرگان) دەناسرێن(٦)

بە قسەی مامۆستا تۆفیق وەهبی: لە سەردەمی هەشتەمی کۆچی لە کوردستان وعیراقی عەرەبداو عیراقی عەجەم ، پیرانی ئیسماعیلی خاوەن بزوتنەوەکانی باتنی تێدا بوون و زیاتر لە ٥٠ هەزار موریدیان پەیدا کردبوو ، هەردوو شاری (سلێمانی)

و(کەرکوك) ببووە مەڵبەندیان و سەرۆکەکانی باتنییەکان مژدەی دەستبەردار بوون لە فەرزەکانی ئاینییان بە گوێی خەڵکاندا دەدا بە بۆنەی (قیامة القیامات) واتە بەرپابوونی رۆژی دوایی و پەیدا بوونی حەزرەتی مەهدی – هـ. ك. – کەوا سەرۆکی ئیسماعیلی بەرجەستە بوو (حسن الروذباری) کە ناوی بە پیرۆز رادەگیراو دەوترا (علی ذکره السلام)، ئەم پیاوە رۆژی نیوەڕۆی هەینی ١٧ رەمەزانی ٥٧٧ ك لە (ئەلەموت) ئەمەی راگەیاندو ئەم رۆژەش بە جەژن لەقەڵەم درا، چالاکییەکانی باتنی یەکان بوونە هۆی دەرکەوتنی ئایینی (ئەهل هەق) کەوا پێدەچێ رەگو ریشەی بگەڕێتەوە بۆ بیروباوەڕی(زروانیە)ی ئێرانی . هەروەها مامۆستا توفیق وەهبی ئەڵێ: سەبارەت بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی باتنی یەکان لە ناوچەکانی کەرکوك و سلێمانی بە تایبەتی لە سەردەمی مەغۆلەکاندا بەڵگەمان ئەو ناوانەیە وەك (دەربەندی بازیان) کە (مستەوفی ٧٣٤ ك) بە (دەربەند خەلیفە)ی نووسیوە ، خەلیفەیش نیشانەی ئیمامەکانی ئیسماعیلی (باتنیەکان)ە، کە خۆیان بە خەلیفەی خودا لەسەر زەوی دادەنا. هیچ جیاوازییەکیش نییە لە نیوان واتای (دەربەند خەلیفە) و (دەربەند ئیمام شاه) تەنیا ئەوە نەبێ کەناوی یەکەم کۆنترە لە دووەم. بەکار هێنانی ناوی لێکدراوی (ئیمام شاه) نزیکترە لە

دەرکـەوتنی ((شـاھ خۆشـین)) کـە لـە سـەردەمی خۆیـدا بـە (باباخۆشین)دەناسراو لـە راسـتیدا خـاوەن بیروباوەڕەکـانی بـاتنی یـەکان لـەم ناوچـانەدا نیـشتەجێن لـە سـەدە گـەلێکی کۆنـەوە و نیشانەی سەرۆکەکانیان بە (بابا) یاخو (پـیر) دەناسـران و ئـەمانـە ئەو کۆمەڵە مرۆڤانە بوون لـە تورکـستان و خۆراسـانەوە بـە ھۆی فـشارەکانی مـەغۆل و داگـیر کردنـی خاکیـان لـە چەشنی پەنابـەر خۆیـان دەگەیانـدە چـیاکانی زاگـرۆس وئەنـەدۆڵ و سـوریە (٧). لەگـەل پەیـدا بـوونی سـەلجوقیەکان لــە ناوچـەکانی ئێـران و دەستبەسـەرا گرتنیـان بەسـەر ئـەو ناوچـانە ، خەلیفـەی عەباسـی (القائم بأمرالله) ھەستا بە پێشوازی کردن لە سولتانی سـەلجووقی (توغرول بەگ)و سوپاکەی ھاتنە ناو بەغداوە بە بێ شەڕ ، پاشـان بەربوونە گیانی دانیـشتوان لـە کوشـتن وبـڕین وخەلیفـەیش ھـەر ناوی ھەبوو ، ئەمیان لادەداو ئەویان دادەنا ، سەلجوقییەکان وایان دەدایە قەڵەم کە فەرمانڕەواییان لە خـواوە وەرگرتـووە و لـە سـەر خـەڵکیش پێویـستە ملکەچـیان بـبن , بۆیـە وەزیرەکـەیان (نظـام الملـك) دەیگـوت: خـودا خـۆی سـولتانی ھەڵبـژاردوە لـە سـەروی بەندەکانیـەوە ،وای لێکـردن ھـەموو ملکەچـی بـن و لێـوەی داوای یارمەتی و دەسەلات بکەن ،بەلام سولتان خۆی ھێزو دەسەلاتی لـە خوای خۆی وەردەگرێ بۆیە بوەتـە جێگـای بـڕوای بەنـدەکانی(٨).

هەرلەسەردەمی سەلجووقییەکاندا دەبینی بیروباوەڕەکانی (عیلمی کەلام )و (سۆفیگەری) پەرەی سەندووە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی سەلجۆقییەکان بە دوور خستنەوەی خەڵکی لە کاروباری سیاسی وملکەچی کردنیان بۆ سوڵتان . ڕەنگە سەردانی سوڵتان( توغروڵ بەگ ) بۆ لای (بابا تاهیری عوریان) هەمەدانی کە شاعیرێکی کوردی ئەهلی هەقی ڕێبازگەی سۆفیزم بوو ، گوێ گرتنی لە نەسیحەتەکانی کە بەڵێنی دا بە (بابا)داخوازییەکانی جێبەجێ بکات ، یەکێك بوو بێ لەم مەبەستانەی سەلجۆقییان هەروەها (نظام الملك) باوەشی بۆ سۆفییان کردبووەوە لە کۆڕو کۆبونەوەیاندا بەشدار دەبوو ــ خەڵاتی دەکردن و خۆی بە خزمەتکاری ئەوان دەزانی وچەندەها (تەکیەو) (خانەقا) پەیدا بوون (٩) . گێڕانەوەی هەندێك لەم بابەتانە تەنیا بۆ ئەوە بوو کە خوێنەر لای بەلای ئەو شتانەدا بڕوا کە بە گشتی لای مرۆڤ پیرۆز بوون کە هەندێ جار خۆیان ئەو ناونازناوانەو دەسەڵاتانەیان بۆ خۆیان دادەتاشی بۆ سوودی خۆیان و دارودەستەکانیان کە بتوانن لەم ڕێگایانەوە بگەنە مەرامەکانیان ، ئێرانییەکانیش یەکێکن لەو گەلانەی توانیویانە هەندێ بیروباوەر پەیدا بکەن و داتاشن بۆ وەرچەرخان و گۆڕانکاری کردن لەژیانی کۆمەڵگاکەیاندا ئەمەش زیاتر وەك لە سەرچاوەیەکدا هاتووە لە

سەدەی ١٨ و١٩ گوایە ئێران کەوتبووە بەر گێژەنگی مشت ومڕی ناوخۆ بە هۆی دور کەوتنەوەی شاهانی خاوەن دەسەلأت لە خەلكەوە بەتایبەتیش پیاوانی ئایینی، لەبەر ئەوە لە زۆر شوێن و شاردا شۆڕش دەست پێدەکات هۆکەشی دیارە کە ئاستی بژیوی خەلك لە باشیدا نەبووە ، جگە لەوەیش ئێران بەشی زۆری دانیشتوانی شیعە مەزەو بوونە و ئەوانی تریش پێکهاتەی زەردەشتی و ئایینە باتنی یەکان و جوولەکە و فەلە بوون ، دیارە ئەم ئایین و مەزەوانەیش لە نیوان خۆیاندا ناتەباو ناڕێك بوونەو خەلكان لە یەکتر دور کەوتبوونەوە، ئارایان ساردو سڕ بووە ، هەروەها هەر یەکێك لەو بیروباوەڕانە ئەوەی دی بە گلاو زانیووە لەعنەتیان لە یەکتر کردوە ، دەلێن بارودۆخەکە وای لێهاتبوو بە ڕۆژی قوڕ و باران چوونە دەرەوە بۆ کەسانی جولەکە و زەردەشتی تالوکەیەکی گەورە بووە نەوەکو خەرقەی تەڕی زەردەشتییەك لە موسلمانێك بکەوێت گەر ئەوە روویدابا ، دەبوایە کابرای زەردەشتی بە خوێنی خۆی ئەم گوناهەی بشتایە ! یاخود ئەگەر موسلمانێك دراوی لە زەردەشتیی وجولەکە و فەلە وەرگرتبا ، دەبوایە پێش ئەوەی بیخاتە گیرفانی پاك بیشوات و بیسملی بکات ، خۆ ئەگەر جولەکەیەکیش چاوی لێبوایە مندالەکەی چۆڕە ئاوێ بە سوالکەرێ موسلمان دەدا ، بە باشی نەزانیوە دەبوایە پیالەکەی

بشكاندایه ! زەردەشتیان تا بۆیان کرابێ خۆیان لەم هەراو شەڕو ناخۆشی یە بە دوور گرتووە. گەلانی ئێران لەم ماوەیەدا دژی زانست و زانیاری و یاساو یەکسانی بوونە و هۆکارەکانی پێشکەوتنی کۆمەلگایان لەبەر چاو گلاّوو دژی ئاین بووە .وەك دەڵێن ئەم گێرەو کێشەیە رێگا خۆشکەرێك بووە بۆ پەیدا بوونی زاتێك بە ناوی (باب – دەروازە) بە گوێرەی بۆ چوونی بابییەکان – دەست دەکاتە بزوتنەوەیەك بە ناوی (بابییە)وبەم ناوەشەوە دەناسرێ (١٠)

## مژدەی دەرکەوتنی (باب):

(شێخ ئەحمەدی ئەحسائی) سەرۆکی تایفەیەك بوو بە ناوی (الشیخیة) کە گرۆیەك بوون لە شیعەو بیروباوەڕە باتنی یەکانی ئێران وگرۆی (شەیخییە) یان (کەشفییە) یەکێکن لە گرۆیانی باتنی یەکانی نێو موسڵمانان و دەرکەوتنیان لە سەر گۆڕەپانی مێژووی رووداوەکان دەگەرێتەوە بۆ (سەدەی سیازدەهەمی کۆچی – نۆزدەیەمی میلادی)، بۆیە بەم ناوە نێونران چونکە دەدرێنە پاڵ شێخ ئەحمەدی کوڕی زەیدەدینی ئەحسائی لە دایك بووی ساڵی ١٧٥٣م گوندی ئەحسا و یەکێکە لە گەورە پیاوانی ئیمامییەکان لە سەردەمی خۆیدا چەندین کتێبی نووسیوەتەوە و یەکێکە لەوانەی بڕوای بە دۆنای دۆن هەبووە و گوایە لەو

باوەڕەدا بووە کە حەزرەتی عەلی و نەوەکانی لە دۆنی مەولا – خودا بوونە و لە مەزهەردا یەکێکن لەخاوەن سیفەتەکانی خوایی ئەگەرچی لە شێوەدا جیاوازن بەڵام لە حەقیقەتدا یەکێکن. ئەم شێخ ئەحمەد ئەحسائیە لە ساڵی ١٨٢٧ م کۆچی دوایی دەکات و پێشتر لە شاری (کەربەلا) خەریکی وانە وتنەوە بووە چەندین قوتابی هەبووە یەکێك لەوانە (کازمی رەشتی)بووە کە بە (کەشفیە) یان (رەشتیە) دەناسرێت لە دایك بووی ١٧٩٠م لە ئیران و کۆچکردو لە کەربەلا ساڵی ١٨٤٣م. پاش کۆچکردنی شێخ ئەحمەدی ئەحسائی ئەم کازم رەشتییە خەریکی وانە وتنەوە دەبێت لە کەربەلا و پاشان( میرزا عەلی محەمەدی شیرازی) دەبێتە یەکێك لە قوتابیانی و کە لە ئیرانەوە هاتبووە لای بۆ وانە وەرگرتن و پاشان بووە سەرۆکی گرۆی بابییە و دامەزرێنەری بیروباوەڕی (١١)، ئەم شێخە لە زۆربەی نووسینەکانی دا ئاماژەی دەکات بە دەرکەوتنی (ئیمامی مەهدی) بە بۆنەی تێپەڕبوونی هەزار ساڵ بەسەر بزربوونی لە پێش چاوان ، کاتێکیش روی کردە ئێران بەهەر شارێك دا گوزەری بکردایە بە یەکێك لە موریدانی رادەسپارد کەوا وەختە ئیمام زهور بکات و دەبێ ئامادەیی خۆیان دەربڕن بۆ پاڵپشت کردنیو پێشیانی راگەیاند کەوا لە گەڵ دەرکەوتنی ئیمام زۆرێك لە بیروباوەڕەکانی ئێستا دەگۆڕێ . شێخ

ئەحمەد لە دوا رۆژانی ژیانیدا وەسیەتی کرد کە (سەید کازمی رەشت)ی ببێتە جێنشینی و راشیگەیاند کە لەو زیاتر کەس لە مەبەستی من تێناگات ، بۆیە دەبێ زانیارییەکانم لای ئەو دەسگیرتان بێت چونکە ئەو لە کاکلەی قسەکانم تێدەگات . ئینجا شێخ ئەحمەد بە سەید کازمی راگەیاند دەبێ بێدارو ئاگاداربیت ،چاوەڕوانی دەرکەوتنی ئیمامی مەهدی بکەیت ! دیارە شێخ دەمرێو ئەو رۆژە بە چاو نابینێ، ئینجا سەید کازمی رەشتیش سالی ١٨٤٣ م لە کەربەلا کۆچی دوایی دەکات و ئەو رۆژە نابینێت، بۆیە لە پاش خۆی کەسی نەکردە جێگری، بەم بۆنەیەوە شەیخییەکان (الشيخية) بوونە سێ گرۆوە،

گرۆیەکیان بوونە سەر بە (محەمەد حەسەن گەوهەر)ی دانیشتووی کەربەلا . گرۆی دووەمیان کەوتنە تەك (حاجی کەریم خانی قاجاری) کە لە (کرمان)ی ئێران دادەنیشت . بەلام گرۆی سێیەمیان نەکەوتنە تەك نە ئەمیان و نەئەویان ، بەلکو دەستیان کردە هاتوچۆی شاران بۆ گەڕان بە دوای زهور کردنی ئیمام کە لای ئەمان کاتی دەرکەوتنی هاتبوو ، سەردەستەی ئەم گرۆیەش کابرایەك بوو بە نێوی (مەلا حوسێنی بەشرەوی) کە زۆر پەیوەندی بە سەید کازمی رەشتی یەوە هەبوو . مەلا حوسێن بەشرەوی لە دوای سەختیەکی زۆر توانی (ئیمامی پەیماندار –

الامام الموعود)له كەسایەتی گەنجێکی خەڵکی شیراز بدۆزێتەوە کە ناوی (سەید عەلی محەمەد)بوو ، کە دواتر ناوی خۆی نا (باب – دەروازە)و لە ویشەوە (بابییە)و پاشان (بەهائییە) دەرکەوتن .سەید عەلی تەمەنی ٢٤ ساڵ بوو کاتێ چاوی بە مەلا حوسێن کەوت لە( بوشەهر)و (شیراز) سەر قاڵی بازرگانی بوو لە تەك خاڵۆیدا لە ساڵی ١٨٤٠ م. سەردانی کەربەلای کردبوو ، ئامادەی وانە وتنەوەی سەید کازمی رەشتی ببوو ، ئەشڵێن رەشتی خۆشی دەویست و رێزی لێدەنا. لە راستیدا ئەوەی بوەتە هۆی ئەوەی مەلا حوسێن بەشرەوی ئەم سەید عەلی محەمەدە بە مەهدی و دۆنی مەهدی بزانێ ئەوە بووە چەند پرسیارێکی نەهێنی ئامێزی شێخی ئەحسائی و رەشتی لێپرسیوە ، ئەگەر تووانی وەڵامی نهێنییەکانی بدرکێنێت، ئەوا یەعنی ئەو, ئەو زاتەیە کە بە شوێنیدا وێڵن و بۆی دەگەرێن و چاوەروانی دەرکەوتنی ئەون ،سەید عەلی وەڵامەکان و نهێنییەکان دەدرکێنێت بە دەلیل و ئیسپات ، لەبەر ئەوە ئەمیش یەکەم کەس دەبێ بڕوای پێ دەکات (١٢) . سەرچاوەی تریش هەن کە باسی ئەم تاقیکردنەوەیەی سەید عەلی دەکەن لە لایەن مەلا حوسێنی بەشرەوی ، دەڵێن پاش ئەوەی وەڵامەکانی دایەوە ، یەکسەر باوەڕی پێکردو سەید عەلی نازناوی (الباب) واتەدەروازەی لە خۆ ناو بەوەی دەبێتە دەروازەی

ئیمامی نادیار و جێگری ، هەروەها نازناوی (باب الباب )قاپی دەروازەی بەخشیە مەلا حوسێن لە ناو خەڵكدا بڵاو بووەوە ، لێرەوە دەستیان كردە جموجوڵ وبرەو پێدانی رێبازەكەیان.

## سەرهەڵدانی بابییەكان:

بابییەكان، یان (بابییە)و(بابی)، لە بنەڕەتدا ئاینێكە كە گرۆیەك لە خەڵكان بڕوایان پێ هەبوو ، لە دەوروبەری ساڵی (١٨٤٣ م – ١٢٦١ ك .)یان (١٨٤٤ م – ١٢٦٠ ك ) (١٣) لە وڵاتی ئێران.نووسەر رەشید خەیوون لە كتێبی (الادیان والمذاهب بالعراق) لە بابی و بەهایی دواوە كە بەشێكن لە گرۆیانی شیعەو لێیان جیابوونەتەوە، لە هەمبەر سەرهەڵدانیان دەڵێ ((لە سەردەمی مەرجەعییەتی ئال كاشفی غیطاء، بزوتنەوەی شەیخییە یان كەشفیە پەیدا بوون ئەمەش هەنگاوی یەكەم بوو بۆ سەرهەڵدان و پەیدا بوونی بزوتنەوەی بابییان و پاشان بەهائییە، ئەوەش زانراوە كە بزوتنەوەی شەیخییە پەیوەند بوو بە شێخ ئەحمەدی كوڕی زەینی ئەحسائی، كۆچكردوی ١٨٢٦، كە لە ئەحسای دورگەی عەرەب لە دایك بووە، كاتێ چوونی بۆ حەج لە رێگا كۆچی دوایی كرد لە نزیك شاری مەدینەی پیرۆز و لە بەقیع نێرژرا، دەڵێن بە هۆی فشارەوە عێراقی جێ هێشتووە.

بــەلاّم ڕێوشــوێنی شــەیخییە و مــشتوومالّە ســۆفیگەرییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سۆفیزمی شیعەیانی زۆرلە مێژین: شەیخییە بە کەشەفییەیش نێو دەبرێت چونکە دەدرێتە پالّ کەشف و ئیلهام – ســروش کــە بانگهێــشت بــۆ ئــەوە دەکــات و موریدانیــشی ئــەو بانگهێشتەی خەلّکان دەکەن و ئەم ڕێبازەش لەو ناوچەیەدا پەیدا بوو پایەکانیـشی قولّبوونەوەیـە و ڕۆچوونە لـە روکەشکاریەکانی شەریعەت و وتنی دەرکەوتن واتە کەشفکردنە هەروەك برِێك لە شێخانی سۆفیزم ئەو ئیددعایە دەکەن وەك لە (دائرة المعارف الشیعیة)دا هاتوو شەیخییان بوونە سێ بەشەوە: (روکنیە) کە پەیڕەوانی (کەریم خانی قاجاری بوون) و (کەشەفییە)یش پەیرەوانی (میرزا محەمەدی باقری ئەسکونی ١٨٨٣ ) بوون ئەمانە وتوویانە یەکگرتن لە نیوان مەرجەعی دینی و ئیمام لە ڕێگای کەشفەوە دەبێت، سێ یەمیان گرۆی (مەلا حوسێن بەشرویی) بوون بە دوای بەلّێن پێدراو – پەیمانـدار(الموعـود)دا دەگەڕان، سەرچاوەکانی بابی و ئەوانی تر ئەوە دەسەلّمێنن کەوا بەشرویی ناسراو بە دەرکی دەروازە (بـاب البـاب). هاوڕێی (مژەپێدراو - الموعود) بووە. عەلی محەمەد شیرازی کاتێ قوتابی بوو لای سەید کازمی رەشتی لە کەربەلا، تا بەم جۆرە بزوتنەوەیەك چەکەرەی کرد لە شەیخییە ئەویش بابییەو پاشان بەهاییە بوو(١٤) ئەم

بزوتنەوە ئایینی یە سەری هەڵداو بەرپا بوو بە هۆی کابرایەکی خەڵکی شاری شیراز کە بە سەید یاخود میرزا عەلی محەمەدی (باب)ی کوڕی میرزا رەزا دەناسرا . ئەم زاتە لە دایك بووی ساڵی(١٨١٩ م – ١٢٣٥ ك )شیراز بوو ، دەڵێن یەکێك بووە لە قوتابیەکانی شێخ ئەحمەدی ئەحسائی ، نێوی دایکی خەدیجە بووە ، ئەم منداڵ بووە باوکی کۆچی دوایی دەکات و خاڵۆی دەیگرێتە خۆی کە نێوی (سەید عەلی بازرگان) بووە .خاڵی نایە بەر خوێندن و فێری چۆنیەتی زمانی فارسی وعەرەبی بوو ، لەگەڵ خۆش نووسیداو لەم بوارەشدا ناوبانگەی پەیدا کرد ، دەڵێن لە ماوەی چوار سەعاتدا هەزار دێڕی بە زمانی فارسی و عەرەبی دەنووسی.لە خۆڕەوشتدا گەلێ سادەو ساکار بوو ، لە منداڵییەوە بە رەوشت بەرز ولاوچاك ناسرابوو ، زۆر قسەخۆش و سەرنج راکێش بووە لەگەڵ ئەو نەوجوانیەی کە سیماو روخسارێکی ئیجگار دلگیری هەبووە و زیاتر رەونەقی پێدا بوو ، پاشان لە لای سەید کازمی رەشتی دەست بەکار بووە لە خوێندن و ئەم سەید کازمەیش دەرچووی ژێر دەستی شێخ ئەحمەدی ئەحسائییە . دوای ئەوەی سەید عەلی محەمەدی (باب)پێگەیشت لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا ژنی هێناو کە گەیشتە تەمەنی ٢٥ ساڵان توانی خەڵکی بە نهێنی بانگهێشت بکاتە سەر بیروباوەڕەکانی و

خەڵکان لە خۆ نزیك بکاتەوە پاش دڵنیابوون لێیان بانگی بە گوێیاندا دەدا کە خودا مەقامی -پایەی (باب - دەروازە)ی پێبەخشیوە (١٥) . بۆ یەکەمجاریش ئەم نهێنی یەی خۆی لای (مەلا حوسێن بەشرەوی) ناوێك درکاند کە زانایەکی ئایینی گەورەی (بوشەهر)ی بوو ، جگە لەوەی پیاو ماقوڵی تایەفەیەك بوو بە ناوی (الشيخية - شەیخیان) کە گرۆیەك بوون لە شیعە و بیروباوەڕە باتنی یەکانی ئێران و سەر گەورەشیان شێخ ئەحمەدی ئەحسائییە . لە راستیدا مەلا حوسێن ئەوی تاقی کردوەتەوەو پاش گوێ بیست بوونی لە وەڵامەکانی سەید عەلی بۆی دەرکەوتووە ئەمە ئەو زاتەیە کە بە شوێنی دا وێڵن ، ئەم شێخییانە باوەڕیان بە (باب) هێناو بە (بابی) ناوزەد کران ، سەرەتا وا پێدەچێ کە ١٨ کەس لەمانە باوەڕیان بە باب هێنابێ و بوون بە موریدی بە ژمارەی پیتەکانی (حي) ناونران.

کە ئەمانە ناوەکانیانە:

١- مەلا حوسێنی بەشرەوی(دەرگای دەروازە).

٢- مەلا محەمەد حەسەن.

٣- مەلا باقری بچووك.

٤- مەلا عەلی بەستامی.

٥- مەلا خودا بەخشی قوچانی ناسراو بە مەلا عەلی رازی.

٦- مەلا حوسێنی بوجەستانی.

٧- سەيید حوسێنی یەزدی.

٨- میرزا محەمەد رەوزخانی یەزدی.

٩- سەعیدی هیندی.

١٠- مەلا ئەحمەد ئەبدالّی مەراغی.

١١- مەلا محەمەدی خویی.

١٢- مەلا جەلیلی رومی.

١٣- مەلا باقری تەوریزی.

١٤- مەلا یوسفی ئەردەبیلی.

١٥- میرزا هادی قەزوینی.

١٦- میرزا عەلی بارفرۆشی.

١٧- زێڕین تاج قورە تولعەین ناز ناو بە (الطاهرة).

١٨- محەمەد عەلی بارفرۆشی ناز ناو بە (قودوس).

پەیڕەوانی بابییە بە ناوی (اهل البیان)یش دەناسران و هەر لەمانیشەوە رێبازەکانی بەهائییەو ئەزەلییە پەیدا بوون، بەتایبەتی دروست بوونی بەهائییە کاتێك بەهائوڵلاّ لە ساڵی ١٨٦٣م خۆی بەکەسی مژدەپێدراو لەقەڵەم دەدات ئەوی باب ئاماژەی پێکردبوو،دەڵێ باب جارڕەرو مژدەدەری من بوو، بەناوی منەوە دەدواو هەواڵی دەرکەوتنمی رادەگەیاند. لایەنگرانی (باب)

بۆ بلاوکردنەوەی بیروباوەڕی باب کەوتنە گەڕان و بلاوبوونەوە بە ناو سەرتاسەری ئێران و تورکستان ، لە مزگەوت و شوێنە گشتیەکاندا دەستیان کردە وەعزدان و پیاهەڵدان بە شان و بالای باب و بیروباوەڕی ، بەم هۆیەوە باب ئاوازەیەکی خۆشی بە دەست هانی و لە هەموو شارانی ئێراندا باسی بیروباوەڕی ئەو دەهاتە گۆڕێ، لەبەر ئەمە زانایانی شیعەی ئێران دەستیان کردە نارەزایی دەربڕین بەرامبەر بەم بیروباوەڕەی باب و بە توندی بەرەنگاری بوونەوە ، گاڵ و دنەی حاکمانی فارسیان لێدان و لە پاش چەندین رووداوی دڵتەزێن لە کوشت وبڕین و زیندانی کردن و دورخستنەوەو گاڵتەپێکردن سوکایەتی کە تووشی (باب)و یارانی بوون، توانییان لە ساڵی ١٨٥٠ م خودی باب بکوژن.

## واتاو نازناوی باب:

وشەی باب بە واتای دەرگا لە رووی رێزمانیەوە ,بەلام لە ئیستیلاح و زاراوەی سۆفیزمدا بە واتای (بابا، پیر، شێخ)ی تەریقەت دێت کە (مورید) لە رێگەو دەرگای ئەووەوە بە کامو موڕادی دەگات: لە بەر ئەوەشە لە لایەن گروپەکانی وەك(دروزی-دروستی) و (ئیسماعیلیە) و (نوسەیری) و ئایین زاکانی وڵاتی کوردستانی ئێمەیش گرنگیەکی تەواوی پێ دەدرێ. چەند راو بۆچوونێك هەس سەبارەت بە واتاو نازناوی میرزا سەید عەلی

محەمـەدی بـاب کـە چـۆن نـاوی خـۆی نـاوە (بـاب)و چ واتایـەك دەگەیەنێت و چۆنی لێکدراوەتەوە؛ هەیانە دەڵێ کاتێ باب دەسـتی کردە خوتبەو ووتار خوێنـدن لـە مزگەوتانـدا و رەخنـە گـرتن لـە پیـاوانی ئـایینی تـوانی نـاوی (بـاب) بەسـەر خۆیـدا دابـڕێ و ئاماژەیش بەوە بکات کە خۆی تاکە دەرگایەوخـەڵکان لێوەی دێنـە ژورێ و داوای لێدەکرێ کە ئەو بیانگەێنێتە خودای گەورە . بۆیـە پەیڕەوانی ناوی (حضرة العلی)یان لێناوە جگە لە نـاوی (نقطـة — بـە واتـەی جێگـای دەرکـەوتنی رۆحـی هـەق و روح الله و مظهـر الله)(١٦) .

سەرچاوەی تـر دەڵـی: بـاب زۆرجـار ئـەم فەرمودەیـەی دەدا بـە گوێی خەڵکاندا (انا مدینة العلم وعلي بابها) مـن شـاری زانـستم و ئیمـامی عـەلیش دەرگایـەتی. زۆر جـاریش بـە ئـەدەب و رێـزەوە باسی لە پێغەمبەر(د.خ.)و ئیمامان دەکرد، قسەکانی لەم بارەیـەوە دلگیر بوون. نازناوی (النقطة) یاخود خالقی خەلقی لە خۆناوە لە کاتێکدا بە خەڵکانی دەگوت گەیشتن بە خودا یەکسەر نـابێ بـەبێ یارمەتیدەر بۆیە هەستا خـۆی بـەو هۆکـارەوە ناسـاند بـە (بـاب)و ئەو کەسانەش بە دوای کەوتن ناونران بابییەکان(١٧) .

دیسان باب پێشتر بە خەڵکی ڕاگەیاندوە کە ئەو زاتی مەهدییە کە پێغەمبەر (د.خ.) بەهاتنی خەبەری داوە، ئێرانیان ئەمەیان بە دڵ نەبووە چونکە وایان لێکداوەتەوە ئەوەی کە دەبێ زهور بێ ئیمامی مەهدی ئاخر زەمانە ، کە دوازدەمین ئیمامێکە کە هەزار ساڵ لەمەوبەر بە شێوەیەکی نهێنیانە لە (سامەڕا) لەبەر چاو ون بووە . هەروا لایان وایە کە هێشتا ئەو زیندوە لە شێوەو روخساری پێشویدا و پەیدا دەبێتەوە ، هەر لەبەر ئەمەش شیعەکانی ئێران ئەم داواو بانگهێشتەی بابیان داوەتە دواوە و بە توندی دژی ڕاوەستاون . دوای ئەمە (باب) بەمەوە ڕانەوەستاوە کە ئەو تەنیا دۆنی جەزرەتی مەهدییە ، بەڵکو نازناوی (نقطة الاولی)ی داوەتە پاڵ خۆی کە ئەمەش نازناوێ بووە موسڵمانان بە مەقام وپایەی پێغەمبەر یاخود (نوقتەی محمەدی)یان شایستە دی بوو ، هەتاوەکو ئیمامەکانیش پلەو پایەی خۆیان لە پاش پلەو مەقامی (نوقتە — نقطة)وە دەبینی وداوای یارمەتی و هێزو روسم و دەستووریان لەو زاتەوە دەخواست (١٨) .

سەرچاوەیەکی شیعەی ئێران دەڵێ : (باب) پاش ئەوەی سەری بە ماڵی خودا ساوی و زیارەتی مزگەوتی گەورەی کوفەی کرد ، هەستا ڕایگەیاند کە ئەو دەرگای دەرکەوتنی (مەهدی)یەو پاشان لای خەڵکی درکاندی کە ئەو ئایین و ڕێبازێکی سازاندوە ، توانی

خـــەڵکانێکی زۆر لـــە وڵاتانـــدا بـــەرەو لای خـــۆی راکێـــشێ و کەمەندکێش بکات بە نواندی چەندین وێنەی جودا و کاری لە ئەقڵ بەدەرو پەرجۆ ، رەنگەلێکی ئاڵووالای پێشاندان کە ئەو کات تەمەنی ١٩ یان ٢٥ ساڵان بووە ، بۆیە پاشتر خەڵکەکە ناویان بە جەنابی (حضرة العلی) ناو ناوە ، ئەمەش لە کاتێکدا بووە کە باب نـاوی (نقطـة – واتـە جێگـەی دەرکـەوتنی هـەق و (روح الله )و (مظهـر الله) لـە خـۆ نـابوو ، لەبـەر ئەمـە دەسـبەرداری نازنـاوە پێـشوەکەی خـۆی بـوو, واتـە نازنـاوی (بـاب)ی بـە جـێ هێـشت و بەخـشی بـە یـەکێك لـە پێرەوکـانی خـۆی کـە یەکـەم کـەس بـوو بـاوەڕی پـێ کـرد پـاش تـاقی کردنـەوەی ، ئـەویش(مـەلا حوسـێنی بەشـــرەوی)بـــوو کـــە خـــەڵکی (خۆراســـان) بـــووە ، لـــە پێنـــاو بلاوکردنەوەی ئەم بیروباوەڕەی بابییەیش گەلێ کاری کـرد لەگـەل دوو زاتـی تـری وەك (محمـەد عـەلی بـارفرۆش و مـیرزا یـەحیای دارابی)ویەکێك لەو ئافرەتانەی کە بە (زێڕین تاج ) دەناسراو کە نازناوی (قرة العـین) ی وەرگـرت وخـاوەن زانـست و حەماسـەتێکی بێ وێنەی ئەم ئایین و بیروباوەڕە بوو ، لە جوانی و فەصاحەت - رەوانبێژی دا هاوتای نەبووە لەو رۆژگارەی ئەم بیروبـاوەڕەی تێـدا پەیـدا بـووە یەکـەمین ئافرەتێکیـشە خـۆی بـە زانـست چـەکدار

کردبێ ولە کۆڕی پیاوانُدا وانەی وتبێتەوە بەبێ روپۆش لەو سەردەمەدا کەخەڵکان بەنەشیاویان دەزانی(١٩).

## بەرەنگاربوونەوە لەم بیروباوەڕە:

لە دوای تەشەنە سەندنی ئەم بیروباوەڕەی بابییەکان لە ئێراندا ، حکومەتی ئێران لەم جولآنەوە ئایینیە مەترسی پەیدا کرد ، بۆیە هەستا بە سوپا ناردنە سەریان و لە هەنگاوی یەکەمدا لە زۆر شارو شوێنا دەست کرایە ئازاردانی بابییان بە تایبەتیش لە (تەهران )و( فارس) ، (مازندەران )و شوێنانی ترو کوشتارێکی زۆریان لێکراو بەلآم ، ئەم زوڵمو زۆرە چۆکی بە بزاڤی بابیەکان نەدا بەڵکو کارێکی وای کرد کە زیاتر خۆڕاگر بن. ئەم هێرش کردنە سەر بابییانە لەو دەنگو باس و هەوالآنە دەهاتە دی کە (سەبارەت بە حەزرەتی مەهدی ئاخر زەمان لە پێغەمبەر (د.خ.) دەگێڕدرایەوەو دەهاتەدی کە شیعەکان بە راستی باوەڕیان پێیەتی و لەلایەن (جابر)ەوە ریوایەت کراوە کە دەفەرمێ : لەو دایە کەماڵی موسا، جەماڵی عیسا، سەبری ئەیوبێ هەیە ، لە زەمانی خۆیدا یارانی زەلیل دەکرێن، خەلق کەللەیان وەك کەللەی دەیلەم و تورك بە دیاری بۆ یەکتری دەنێرن ، دەکوژرێن ،دەسوتێنرێن ، لە ترسانا دەلەرزێن ، دەسڵەمێنەوە ، زەمین بە خوێنیان رەنگ دەگرێ فریادو فوغانی ژن و منالًیان

دەگاتە ئاسمان ئەمانەن بە راستی دۆستانی من کە بـە سـایەتانەوە هـەموو شۆرشـێك دەکوژێنمـەوە ، لـە زەلزەلـە خەبـەردار دەبم ، پێوەندو زنجیر دەپچڕینم)(٢٠) .

مێژوونوسـان دەڵـێن لەلایـەن (سـولتان محەمـەد شـای قاجاڕ)و(ناسـرەدین شـا)ی کوڕیـەوە دەسـت کـراوە بـە لـەناوبردنی ئـەم بیروبـاوەڕەی بابییـەو لەگـەل بـوونی جیـاوازی لـە ژمـارەی قوربانیەکانی ئـەم تایەفەیـە و ژمارەیـان لـە ئێرانـدا ، هەنـدێکیان وتویانە سەرژمێرییان ٣٠ هەزار کەس بووە و ژمارەی کوژراوانیـان لـەو شـەڕانەدا گەیشتووەتە ٢٦٠٠ کـەس و زوربەشـیان لـە (قـەلای تەبـەری)لـە مازنـدەران هاتونەتـە کوشـتن و ژمـارەی سـەربازانی کـوژراوی میریـش گەیـشتووەتە ٥٠٠ کـەس، هـەروەها ژمارەیـەکی بەرچـاویش لـە ئافرەتـانی تایەفـەی بابییـە بونەتـە قوربـانی ئـەم شەڕانە، چونکە ئافرەتیـان یارمـەتی پیاوانیـان دەدا لـە شـەڕەکاندا بـە گەیانـدنی ئازوقـەو ئـاوو خـۆراك ، چـەك و پێداویـستی بـۆ جـەنگاوەران (٢١) . ئـەو سـوپا ناردنـە سـەر بابییانـە لـە شـارو شارۆچکەکانی ئێران لە یەکەم هێرش و پەلاماردا تووشـی شکست بـوو، بۆیـە مەترسـییەکە زیـاتری پـەرە سـەندو هێرشـێکی تریـان دەسـت پێکـردو لـە ژێـر فەرمانـدەی (مەهـدی کـولی مـیرزا)ی بنەماڵەی شای ئێـران و کەچـی هەمـدیس ئـەم هێرشـەیش سـەری

نـەگرت و سـوپا شـكاو پـاش شـەڕێكی سـەخت و هێـز لەسـەر هێـز ناردن بۆ پاڵپشتی ئەم سوپایە ، سوپای ئێران هەستا بـە پـەلاماری سـێیەم بـۆ سـەر بابییـەكان و ئـەم سـوپایەش تێكـشكێندراو لـەم شـەڕەدا (مـەلا حوسـێن بەشـرەوی) برینـدار بـوو كـە نـاودارێكی گـەورەی ئـەم بزاڤـە بـوو، بـە هـۆی سـەختی برینەكەیـەوە دەسـت بـەجێ كۆچـی دوایـی دەكـات، ئەمـەش هـیچ كاریگەرییـەك ناكاتـە سـەر نۆشـستی هێنـان بـە بیروبـاوەڕی بابییـەكان، بـەڵكو زیـاتر سووربوون لە سەر داكۆكی كردن لەسەر ئایین وڕێبازو بزاڤەكەیان وگەلێ خۆڕاگر بوون. زیاتر چۆكیان بـە دوژمنانیـان دا دا ، بۆیـە حكومەتی ئێران ناچار بوو چوارەم پەلاماری خۆی دەست پێبكـات بـۆ سـەر كـوت كردنیـان ، ئـەم جارەیـان بـە بـەكار هێنـانی تـۆپ و زرێپـۆش وچـەكی هەمـە جـۆر ، بـەلاّم بابییـەكان توانییـان بەرگرییەكی بێوێنە پیشان بدەن وبۆ ماوەی چوار مانگ بجەنگێن و گەلەك لە پیاوانیان كوژران و ئازوقەیان كەم بووەوەو تێكچوو ، بەم هۆیەوە سەربازانی شاه توانییان بـچنە نـاو حەشـارگاكانیان و ٢١٤ كەسـیان بـە دیـل بگـرن لـە پیـاو وژن ومنـداڵ ، هەرچـەندە پێشەكی ئەم خەڵكانەیان دڵنیا كردبـووەوە لـە نەكوشـتنیان ، بـەلاّم سەربازانی شاه كـارێكی نـەكردەنییان كـرد بـە سـك دڕیـن و زمـان بڕین شێواندنیان (٢٢) . لەگەل ئەم كردەوانەشدا بابییـەكان هـەر

بەردەوام بوون لە بەرەنگاری و خۆراگری لە شوێنانی تردا بەرامبەر بە سوپای ئێران ، بۆ ئەم مەبەستە خەڵکی (زنجان) پایتەختی هەرێمی کامسیە راپەرین بەسەرۆکایەتی فەرماندەی ئەم بزاڤە (محەمەد عەلی زنجانی)و بۆ چەند جار سوپای شایان شکاندو دژی وەستان و گەورەترین خۆراگرییان نواند ، بەڵام لە کۆتاییدا بەسەریاندا زاڵ بوون لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا بابییەکان هەر بەردەوامی خۆیان لە سەر بزاڤەکەیان درێژە پێداو حکومەتی ئێرانیش نەیدەزانی چ کارێك بکات بۆ دامرکاندنەوەی ، وای بە چاك زانی سەرۆکی بابییەکان سەید عەلی محەمەدی (حضرة العلی) بکوژرێ ، هەرچەندە ئەم پیاوە وا خۆی پێشاندا کە ئەو توندوتیژی لە گەل حکومەتدا نانوێنێ و روبەرووی سوپای ئێران نابێتەوە ، بەڵام حکومەت بانگی کردو پرسیاری ئەم ئایینە نوێیەی لێپرسی و بەوەی تاوانبار کرد کە لە رێ و رێبازی جەماعەت دەرچووتە دەرەوە ، بۆ ئەم مەبەستەش گرتیان و کوشتیان و کەوڵیان گرتەوە ، ئەم روداوەش لە رۆژی ٢٨ی شەعبانی ١٢٦٦ ك بەرامبەر بە ٩ی تەمووزی ١٨٥٠ م لە تەمەنی ٣١ ساڵیدا بووە . سەرچاوەکان دەڵێن لە کاتی شەهید کردنی سەید عەلی محەمەدی (باب)دا لاوێکی دڵسۆزی باب هەبووە بە نێوی( محەمەد عەلی) بۆ شەهید بوون لە گەل بابدا بە زمانێکی ئاگرین

دەپاڕایەوە لەبەر ئەوە لە تەورێز پێکەوە برانە مەیدانی قشڵەی کۆن بە باڵ بەستراوی سەری محمەد عەلی موریدی موخلصی لەسەر سنگی پیری خۆشەویستی دانرابوو ،لەبن هەنگڵیانەوە بە گوریس بە یەکەوە بەسترابوونەوە بەم جۆرەهەڵواسران ، بۆ کوشتنیان فەوجێکی (ئەرمەنی)یان هێناو دایانیانە بەر دەسرێژی گوللە ، کەچی روانییان کەم تا زۆر ئازاریان پیێ نەگەیشتووە و سەلامەتن و گوللەکان تەنیا گوریسەکانیانی پساندبوو ، دیارە ئەمەش موعجیزەیەکە بۆ (باب) ، (ئەرمەنییەکان) کاتێ ئەم روداوەیان بینی بە موعجیزەیان لە قەڵەم داو ئامادە نەبوون جاریکی دی دەست رێژیان لێبکەن لەبەر ئەوە فەوجێکی عەسکەری دییان هێناو درانە بەر گوللەو کوژران(٢٣).

ئازایەتیەکی حاشا هەڵنەگرە کە باب توانی بیروباوەڕی خۆی بداتە بەرگوێی خەڵکانی ئێران و دامودەزگا حکومیی و ئایینیەکەی،لەبەر ئەمە تووشی چەندین چەوسانەوەو سەرکوتکردن بوونەو دەنگوباسی باب و لایەنگرانی دەگەوێتە ناو کۆمەڵەی دەوڵەتانی ئەوروپاو رۆشنبیرانی ئەو وڵاتانە لە چۆنێتی سەرکوتکردنیان و خۆراگری باب و یارانی. لە راستی دا شەهید کردنی باب و زەڕین تاج خانم زیاتر تینی ئاگری بزافەکەی خۆش کردوەو بۆتە هۆی زیاد بوونی شەوق و ئیلهامی بەردەوام

بۆ سوریدانی و ئاگری ئەو عەشقە زیاتر تاوی سەندوە . پاش کوژرانی باب (حضرة العلی) بابییەکان سارد نەبوونەوە لە سەر بیروباوەڕیان ، بەڵکو زیاتر شەیگیربوون و هەستان (میرزا یەحیای دارابی)یان بە جێنشینی باب (حضرة العلی) داناو نازناوی (حضرة الازل) یان پێبەخشی، بەلأم ئەم سەرۆکە نوێیە وای بەچاك زانی پایتەختی ولأتی ئێران بەجێ بهێڵێ و دەست بکاتە گەڕان بە ناو موریدانی بۆ چەسپاندنی ئیمان و بیرۆکەی ئایینەکەی لە دڵیاندا ، بەلأم لەولایشەوە بابییەکان بەسەر هاتی سەرۆکی یەکەمیانیان لە یاد نەچووەوە، لەبەر ئەوە لە ساڵی، ١٨٥٢م سێ کەسیان هێرشیان کردە سەر شاه بۆ کوشتنی بەلأم سەرکەوتنیان یار نەبوو، سەربازانی شاه توانییان دەستگیریان بکەن و ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆریان دان ، پاشان حکومەتی ئێران دەستی کردە گرتنی بابییەکان لەوانە ئەو ئافرەتە شۆرشگێڕەی ئەم بزوتنەوەیە کە (قرة العین)و زەڕین تاجیان ناو لێنا بوو ، گەلێ پڕوپاگەندەی پڕوپوچیان بۆ هەڵبەست و بە زیندوویی ئاگریان تێبەردا ، دوایش ئەوانەی گیرابوون لە پیاو ژن و منداڵ بە شێوەیەکی نامرۆیانە کوشتنیان ، خەڵکان لە کوچەو بازاڕی تاراندا بە چاوی خۆیان روانییان چییان بەو بابییانە دەکرد کە کارەساتەکە جەرگی مرۆڤی دەبڕی ، چەند پۆلێك لە ژن و پیاو

منـــداڵ بـــه گـــوریس دهســـت بهســـتراوو لهشـــیان برینـــدارو لههـــهر برینێکدا فتیلهیـهکی گڕ گرتوویـان تـێ ئـاخنیبوو ، دیمـهنیان بـه رووتـی لـهو رۆژهی دهکـرد کـه لـه دایـك ببـوون و سـهربازانیش لـه دواوه لێیـــان دهخـــوڕین و دهدا ، ئـــهوهی بکهوتایـــه بـــه قامـــچی دهیانکوشت و ئهگهریش منداڵێك بمردایه فڕێیان دهدایه ژێر پێـی بـاوك ودایکیـهوه ، ئـهوانیش بـه سـهریدا تێدهپـهڕین بـۆ ئـهوهی ئاوڕی لێبدهنهوه ، منداڵیان دههێناو لهسهر سنگی دایك و باوکیان ســهریان دهبــڕین(٢٤) ، لهگــهڵ ئهمانهشــدا بابییــان دانیــان بــه خۆیانــدا دهگــرت و لهپــهلوپۆ نهکــهوتن و ههرچــهنده دهنگیــان ههندێ کـپ کرایـهوه بـهڵام بزاڤـه نهێنـی یهکـهیان هـهر بـهردهوام بوو که گهورهترین داستانی خۆراگرییان تۆمارکرد.

## خاتوو (قرة العين)(٢٥):

له دوا ساڵانی دهسهڵاتی (نهجیب پاشای عوسمانی) له عێراقـدا ، دهنگوباسی ئهم ئافرهته کۆمهڵگای عێراقی خهریك کردبـوو بـهو قـسانهی ســهبارهت بــهم ئافرهتــه لــه گۆڕێــدا بــوو ، خــاتوو قورهتولعهین له ساڵی ١٨١٤ ز له( قهزوین) هاتووهته دنیاوه ، نـاوی (زێڕین تاج )ی لێنرا ، له بنهماڵهیهکی ئایینی ناسراوی ئـهم شـاره گۆش کرابوو ،که باوکی (مـهلا صالح)ی نـاو بـوو, یـهکێك بـووه لـه پیاوه ئـایینی یـهکانی ئـهم شاره ، خـاتوو لای بـاوکی فێـری وانـهو

زانستە ئایینیەکان کرابوو ، لە تەمەنی ١٤ ساڵان درایە کوڕی مامی کە نێوی (محەمەدی کوڕی مەلا محەمەدی تەقی)بوو ، پاش ماوەیەك خۆی ومێردەکەی روویان کردە کەربەلا بە نیازی خوێندن و فێر بوون ، لێرەدا ١٣ ساڵ مانەوە و دوو کوڕیان بوو ، وا دیارە نێوانیان زۆر خۆش نەبووە بە هۆی مەیلی خاتوو قورەتولعەین بەلای (سەید کازمی رەشتی)دا دەشکایەوە کە سەرۆکی شەیخییەکان بوو لەو رۆژەدا ، بەلام مێردەکەی خاتوو لە گەل ئەو کەسانەدا بوو کە پێیان دەگوترا (بالاسەری)و دژی سەید کازمی رەشتی بوون کە ئەمیان بە (پشت سەری)دەناسرا. ساڵی ١٨٤١ م گەڕانەوە قەزوین و لەوێش منداڵێکیان بوو ناویان نا (ئیسحاق). باوکی مێردەکەی کە ناوی (مەلا محەمەد نەقی)بوو کە دەیکرد مامی قورەتولعەین ، ئەمیش زانایەکی ئایینی بوو بەلام دژی شەیخییەکان بووە ، هەستا بە دەرکردنی فتوایەك دژی بیروباوەڕی شەیخییان و بە کافریانی لە قەڵەم دا ، ئەمەش زیاتر نێوانی ئەم ژن ومێردەی تێکدا چونکە قورەتولعەین مەیلی زیاتر بەلای شەیخییان و سەید کازمی رەشتی یەوە بوو ، بۆیە ساڵی ١٨٤٣ م بڕیاریدا سەردانی کەربەلا بکات و بچێتە حزوری رەشتی بۆ گوێ گرتن لە وانە و زانستە ئایینی یەکانی ، بەلام کاتێ خاتوو گەیشتە کەربەلا روانی چەند رۆژێکە رەشتی کۆچی دوایی

کـردوه ، وادیـاره قورەتولعـەین بـە نهێنـی بـاوەڕی بەرێوڕچەی بابییە هێنـابوو ، لێرە مایـەوەو دەستی کردە وانـە وتنـەوەو ، لـە ژورێکـدا دادەنیـشت کـە دەرگـای بـە پەردەیـەك داپۆشـرابوو بەرامبەریشی ژوورێکی گەورە هەبوو بۆ قوتابیان و گوێگران و لـە پشت پەردەوە دەرسی دەوتـەوە ، خـاوەن دەنگێکی زولاڵـو خـاوەن توانا بوو لە قسەکردن و بدەوبستاندا ، لە کەربـەلا دەنگی دایـەوە خەڵکان ئاڵو گۆڕی بیرو بۆچوونە نوێیەکانی ئەمیان دەکرد ، ساڵی ١٨٤٦ م ڕووی کـردە (کازمییـە)ی بەغـداو دەسـتی کـردە وانـە وتنەوەو خەڵکانێکی زۆری شیعە وئەوانی تـر ئامـادەی کۆبونـەوەو وانـەکانی دەبـوون ، قورەتولعـەین رەنگـە زۆر خـۆی دانەپۆشـیبێ دەموچـاوی بـە دەرەوە بـووبێ ، یـان دوو دەسـتی ، لەبـەر ئـەوە ناحـەزانی شـتی نارەوایـان دەدایـە پـاڵ ، قورەتولعـەین بـە ئاشـکرا دەسـت دەکاتـە بانگهێـشتی خـەڵکان بـۆ سـەر ئـەم بیروبـاوەڕە و هەنـدێ کـەس وای بـۆ چـوونە گوایـە خـاتوو خـۆی بـە دۆنـی حـەزرەتی فاتیمـە زانیـووە و هەریـەك لـە یـارانی بـە ئیمامێـك تەشبیە کراوە ، بۆیە تووشی گێرەو کێشەیەکی سەخت بووەتـەوە لە شاری بەغدا هانی حکومەتی لێدەدرێ لە لایەن ناحەزانیەوە لە وانـەی لایـەنگری (محەمـەد حەسـەن گەوهـەر) بـوون کە کرابـووە دەمسپی شەیخییان بەم بۆنەیەوە والی بەغدا(نەجیب پاشا) ناچار

بوو نامەیەك لەمەڕ قوڕەتولعەینەوە بنێرێ بۆ ئەستەموڵ و خاتوویش لە ماڵی (موفتی ئەبی سەنای ئالووسی)دەستبەسەر بكات تاكو وەڵامی ئەستەمولی پێ دەگات لەم بارەیەوە ، كاتێك دەنگوباسی دەستبەسەر بوونی خاتوو لە شاری بەغدا دەگاتە قەزوین ، مامی هەڵدەستێ كەسێك دەنێرێتە لای یەكێك لە پیاو ماقولانی كەربەلا بۆ رزگار كردنی قوڕەتولعەین و.یارمەتی بەرەڵلا كردنی لە لایەن حكومەتەوە ، ئەو كەسەیش دێتە لای (ئالووسی)و تكای لێدەكات بە پاشا بلێ با رزگاری بكات ، ئەمیش بەڵێنی دەداتێ . وادیارە هیچی بۆ ناكرێ تاكو فەرمانی ئەستەمولّ دێت و تیایدا داوای بەرەڵلا كردنی خاتوو قوڕەتولعەین و دەركردنی لە عێراق رادەگەیەنێت. خاتوو كاتێ كەوتە رێ و بەغدای بەجێ هێشت برێ لە یارانی كەوتنە تەكی و ، ئەمانە لە هەنگاوی یەكەمی سەفەرەكەیاندا گەیشتنە (كرماشان )ی كوردستان ، لە نووسراوێكی دەسنووسی تایبەتدا كە بە زمانی كوردی نووسراوەتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ هەمان مێژووی چونی قورەتولعەین و یارانی بۆ ناو كوردانی كرماشان و بلاّو بوونەوەی دەنگوباسی هاتنیان لە ناوچەكانی رۆژهەلاّتی كوردستان ئەم راستیەمان دەستگیر دەبێت كە بەشێك لە كوردەكانی كرماشان كارێگەری ئەم بیروباوەڕەی بابییەیان لەسەر بووەو لە نوسراوە

ئایینی یەکانـدا ڕەنگـی داوەتـەوە. گۆدفری ڕۆڵـی درایڤـەر (١٨٩٢ - ١٩٧٥) نووسـەرو زانایـەکی ڕۆژئاوایـە ولـە سـەرەتای سـەدەی بیستەمدا مێژوو ئایینی کوردانی خستوەتە بەر توێژینـەوە و بـە شێوازێکی بابەتیانە لـە چەندین بواری جیاجیای کۆمەڵایـەتی - فەرهـەنگی - مێـژوویی گـەلی کـوردی کۆڵیوەتـەوە، زیـاتر ئـەو زانیارییانەی لـەو کاتـەدا بـە دەستی هێنـاوە کـە وەك ئەفسەرێکی بریتانی پەیوەندی لەگەڵ کار بـە دەستانی (انتـداب)ی عێراقیـدا هـەبووە، جگـە لـەوەی مامۆسـتای مێـژوو بـووە لـە زانـستگەی (مەگدێیلن) لە شاری ئۆکسفوردی بریتانیـاو پـسپۆری زمانـەکانی عیبری و یاسای بابلی بـوە، زمـانی عـەرەبی زانیـوە. نووسـەر لـەو تارێکدا(٢٦) کە ڕاستەوخۆ کراوەتە کوردی باس لـە ئـاینی کـوردان دەکات و ئـەڵێ جۆرایەتیـەکی بەرچاوی ئـایینی لـە نـاو کوردانـدا هەیە لـە نـاو ئەوانەشدا فیرقـەی(قزلبـاش و بـابی و ئیـزەدی)یـن، فیرقەی بابی میرزا عەلی محەمەدی شیرازی لە سـاڵانی ١٨٤٤ وە ١٨٤٥ دا لـە ئێـران بنیـاتی نـاو خـۆی بـە فـەرمانی حکومـەتی ئێـران لـە تەورێز کوژرا، ئیعدام کردنەکەش بە یارمەتی کوردی شقاقی هاتـە ئـەنجام(٢٧) ، بـەڵام بزوتنەوەکـەیان بـە هـۆی جێگرایـەتی و لایەنگرانی گیانفدای بابیەوە درێژەی کێشاو ئێستا مەرکـەزیان لـە (عەککا)دایە... بابییـەکان بـە گومـانن لـە ڕاسـتی بـوونی قورئانـدا

هەیە وەك ئاكامێك دەستووراتی وەرگیراو لە تەفسیری قورئان دەدەنە دواوە و نوسراوەیەكی بێ نەزمی ئەو تۆیان كردۆتە جێ نشینی كە تەعلیم و فێركردنەكانی روون نیە، بابی باوەڕیان بە چەشنە(تناسخ)ێكی رۆح هەیە، بابیەك نامرێ و مردن تەنیا لە بەر چاو ونبوونی سەردەمی كۆنە پێش ئەوەی دەرگای ژیانێكی تری بۆ یەكالا بكرێتەوە: لەم (تناسخ – دۆنای دۆن)دا كە دەتوانرێ شوێنی هەتا مەودایەكی زۆر هەڵبگیرێ.. دەگوترێ ژمارەی كەسانێ كە لە كوردستان لە سەر ئەو ئایینەن لە ٥ هەزار كەس تێپەڕ ناكات، كە ئەوانیش لە گوندەكانی مەڵبەندی هەكاری – نیوان باشقەلا و قوتووری نزیك سنووری تورك و ئێراندا نیشتە جێن(٢٨) هەروەها لە كتێبی (ایلات و طوایف كرمانشاهان)ی محەمەد عەلی سوڵتانی كە باسی خێڵە كوردەكانی كرماشانمان بۆ دەكات نووسیویە كەوا لە رۆژانی فەرمانڕەوایی (محەمەد عەلی میرزای دەوڵەت شاه) ، شێخ ئەحمەدی ئەحسائی بۆ ماوەیەك لە كرماشان بووە و چەندین خانەدانی كوردان چوونەتە سەر رێوڕچەی ئەم زاتە بە تایبەتیش هۆزی (كەڵهوڕو خزاعی)، بەلام لە دوایی دا پەشیمان بوونەتەوەو ئەمڕۆ ئەو كاریگەری یەیان بە سەرەوە نەماوەو بوونەتە شیعە ! ئەز وای بۆ دەچم نووسەر محەمەد عەلی سوڵتانی لەبەر نەبوونی ئازادی

ئایینی له ئێران ، هاتووه هەموو ئایین و بیروباوەڕە باتنی یەکانی ناو کوردانی بە شیعە لە قەلەم داوە کاتێك باسیان دەکات ، یاخود دەڵێ لە بیروباوەڕە کۆنەکانیان پاشگەز بوونەتەوە(٢٩) .

لە کتێبی (الحدیقه الناصریه) فی تاریخ و جغرافیا کردستان کە دانەری عەلی ئەکبەر کوردستانی یە ئەنووسێ کوردانی کوردستانی ئێران سوودیان وەرگرتووە لە شۆڕشی بابییەکان بە تایبەتی ناوچەکانی هەورامان و بە سەرۆکایەتی حەسەن سوڵتانی هەورامی لە ساڵی ١٢٦٨ ك/١٨٥١ م یاخی بوونی خۆی رادەگەیێنی لە شای ئێران و کاتێك غولام شاه خان والی کوردستان دەبێت، بەڵام نووسەر لە روداوی ساڵی١٢٧٠ ك/١٨٥٢ م بابەتێکی تر دەگێڕێتەوەو دەڵێ لەم ساڵەدا میرزا عەبدولصەمەدی هەمەدانی کە یەکێك بووە لە جێگرانی حاجی محەمەد کەریم خانی کرمانی سەر بە ڕێرەوی(شەیخییە)دێتە کوردستان (سنە) و بۆ برەو پێدان و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی، لەم بارەیەوە لەگەڵ والی کوردستان رێکدەکەوێت، بەڵام زانایانی ناوچەکە کە هەموو سوننەی شافعی مەزەون ویستیان والی لەو پاڵپشتەی میرزا عەبدولصەمەد کەمکەنەوە بەڵام سوودی نەبوو هەوڵ و کۆششیان بە فیڕۆ چوو، بۆ ئەم مەبەستە دانشتنێك ساز دەکەن لە (گۆڕستانی شێخان)ی رۆژ ئاوای سنە بۆ دەرکردنی میرزای ناوبراو بەڵام والی بە گوێیان

ناکات, لە بەر ئەوە ئاژاوە و تالان برۆ دەست پێدەکات پاشان کوشت و برو شار بەجێهێشتن، ئەم شەڕە لە کوردستان ناو نراوە بە (جەنگی کاروان سەرا)(٣٠) ئەوەی جێگای سەرنجە والی کوردستان غولام شاخان لە سالی ١٨٥٢ م ڕێگا بە زانایەکی تایەفەی شەیخییە دەدات بێتە کوردستان و بیرو باوەڕی بلاوبکاتەوە کە بابییە هەر لەمانەوە چەکەرەی کردوە، کەچی نووسەر عەلی ئەکبەر دەڵێ سالی ١٨٥٠م فیتنەی بابییەی بەهائیە لە شاری زنجان پەرەی سەندو هەرەشەی دەکردە سەر دەسەلاتی شای ئێران بۆ ماوەی ٧ مانگ بەرامبەر سوپای ئێران خۆراگر بوون : بەلام حەسەن عەلی خان لەگەڵ فەوجی کروس هێرشی کردنە سەر ئەو تایەفە توندڕەوە و توانی لە ماوەی ٢٥ رۆژدا بە سەریاندا سەرکەوێت و توانی (مەلا محەمەد عەلی)یش بکوژێت (٣١)

بەڵێ پاش ئەوەی قوڕەتولعەین و یارانی گەیشتنە ناوچە کوردییەکان بە تایبەتی کرماشان خەڵکێکی زۆریان لێ کۆبوونەوە ، خاتوو باسی نهێنییەکانی ئەم بیروباوەڕەی پێ راگەیاندن و زۆریان کەمەندکێشی بوون ، لە ژن و پیاوانی ئایینی و دەسەلاتداران برێکیشیان بەسەر سوڕمانەوە لای دەردەچوون، بۆیە پیاوانی ئایینی ناوچەکە کەوتنە ناڕەزایی و شکایەت لەم خانمەو یارانی و داوایان لێکردن شار بە جێبهێڵن. قوڕەتولعەین

باروبنـەی پێکەوە نـاو لەگـەل یـارانی گەیـشتنە شـاری هەمـەدان ، لەبەرئـەوەی خـەڵکی هەمـەدان زوربـەیان سـەر بـە شـەیخییەکان بـوون پێـشوازییەکی گـەرمیان لێکـردو, نـۆ رۆژان لایـان مایـەوەو بەگەرمی بیروباوەڕەکەی لە ناویاندا بلاّو دەکردەوە . کەسـانی زۆر هاتنە سەر بیروڕاکەی و دوو کەسیش بە ناوی (مەلا یاهو)و (مـەلا لالـەزار) لـە پیـاوانی ئـایینی یـەهودییان کەمەندکێـشی بـوون و بڕوایان پێهێنا . ناچار بـوو هەمـەدان بـە جێ بهێڵێ و رووبکاتـە شارەکەی خۆی قەزوین و کاتێ گەیشتە شـار چـووە مـاڵی بـاوکی و نەچـووە ماڵەکـەی خـۆی بـۆ لای مێردەکـەی مـەلا محەمـەد . پیاوەکەی چەندین ئافرەت و پیـاوی بـە شـوێنیدا رەوانـە کـرد کـە بێتـەوە نـاو مـاڵ ومنـداڵی ، کەچـی قورەتولعـەین رازی نـەبوو ، وتبووی ئەگەر مێردەکەی  پیاو بوایە دەکەوتە تەکی بۆ کەربـەلاو دەبووە هاوڕێی سەفەری و لە خەوی غەفڵەتی بیـداری دەکـردەوەو ڕێگـای هـەقی پێـشان دەدا. دیـارە ئەمـەش یەکـەم جـارە ئـافرەت پیاوی خۆی بـە جێبهێڵێ و بـێ گـوێ دانـە شـەرع وداب و نـەرێتی بـاوی کۆمـەڵگا، لەبـەر ئـەوە ئەمـە بـوو بـە چـەکێ بـە دەسـتی ناحەزانیـەوە کـە زۆر بـە تونـدی رەخنـەیان لێـدەگرت و شـتی ناڕەوایـان بـۆ هەڵدەبەسـت ، جگـە لـەوەی ئـاگری دوژمنایـەتی لـە نێوان خۆی و مامیدا زیاتر پەرەی سەند و مـامی لـە پاش ئـەوەی

دەچووە مزگەوت و سەر مەنبەر, یەکسەر جنێوی بە پیاوانی شەیخییەکان دەدا ,وەك سەید کازمی رەشتی و شێخ ئەحمەدی ئەحسائی ، لەبەر ئەوە رۆژێکیان کابرایەك لێی هاتە دەست و کوشتی . ئەمەش بووە هۆی ئاژاوە بەرپابوون و ژیانی شەیخییان و بابییان کەوتە خەتەر ، قورەتولعەین چەند رۆژێ بەر لە کوژرانی مامی دڵی خەبەری دابوو کە ئاژاوەیەك بەرێوەیە هەڵدەستێ ئیزنی یارانی دەدا کە بلاوەی لێبکەن و هەرکەسێ بچێتە شارو ماڵی خۆی ، تەنیا بە دوو کەسیانی راگەیاند کە وادەی شەهید کردنیان زۆرنزیکە . دەڵێن ئەم پێشینییەی قورەتولعەین هاتە دی و (شێخ صالح کەریمی)، یەکەم کەس بوو لە سێدارە درا، (مەلا ئیبراهیمی مەلاحەتی) لە قەزوین کوژراو قورەتولعەینیش گیراو دەست بەسەر کرا لە سەرای حاکم و, ماوەیەك مایەوەو توانی نامەیەك بۆ (میرزا حوسێنی عەلی) کە پیاوێکی دەوڵەمەندو خاوەن پایە بوو, جگە لەوەی لە مێژ بوو بیروباوەری بابییەکانی پەسەند کردبوو ، سەید عەلی محەمەدی(باب) نازناو (بەهائوڵلا)ی پێبەخشیبوو . ئەم بەهائوڵلایە توانی قورەتولعەین بدزێ لە قەزوین و بیگەێنێتە تاران و لە ماڵەکەی خۆیدا بیشارێتەوە تاکو کۆنگرەی (بەدەشت) نزیکی خۆراسان بەستراو قورەتولعەین تێیدا بەشدار بوو، خاڵە

سەرەكییەكانی كۆنگرەكە بریتی بووە لەوەی چۆن بتوانن (باب) رزگار بكەن كە زیندانی كرابوو – دیارە لەم ماوەیەدا سەید عەلی (باب)لە سێدارە نەدرابوو . دووەم خاڵی كۆنگرە ئایا ئەحكامەكانی شەریعەتی ئیسلام هەڵدەوەشێتەوە یاخود وەك خۆی دەمێنێ لەبەر ئەوەی لای ئەوان (باب)واتە حەزرەتی مەهدییەو زهوری كردوە دەبێ شەریعەتەكانی پێش خۆی هەڵوەشێتەوە ، دیارە (قورەتولعەین)یش لە سەر ئەم رایە سوور بووە ، بۆیە لە كۆتاییدا چەندین دانیشتنی لە گەڵدا ئەنجامدراوە لە لایەن زانایانی ئێرانەوە سەبارەت بە ئیمامی مەهدیو چۆنیەتی زهور بوونی لە شارەكانی جابلقاو جابرسا وەك لە سەرچاوە ئایینی یەكاندا هاتووە، (قورەتولعەین)یش وتوویە ئەم دوو شارە لە وجوودا بوونیان نییەو مەسەلەكە ئەفسانەیە و ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەوترێت (باب - دەروازە)و لەپێش چاواندایە بریتی یە لەو حەزرەتە چاوەڕوان كراوە كە هەزار ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە. بۆیە بەلەئایین هەلگەڕاویان دایە قەڵەم و بڕیاری كوشتنیان داو سوتاندیان. قورەتولعەین ئافرەتێكی زۆر جوان و زیرەك و بێ وێنەی سەردەمی خۆی بووە لە قسە كردن و وتار خوێندنەوە و دانوستاندن كەسایەتییەكی كەم وێنەی ناو ئەم بزافە ئایینییەی بابییەكان بووە ، هەرئەم خانمەیش بووەتە هۆی پەرەسەندنی

بیروباوەڕەکەیان و لەم پێناوەشدا سەری نایەوە ، دەست ودامێن پاك و لە زۆر شوێندا ستایشی ئەم پاکیزەییەی کراوە کوردەکانی ئەو سەردەمەی کرماشان بەسەر هات وداستانی ئەمیان نووسیوەتەوە . سەرچاوەکانیش هەندێکیان زەمی دەکاو هەندێکیشیان قەدرو حورمەتێکی شایستەیان پێداوە ، دکتۆر عەلی وەردی لە هەموو لێکۆڵەرێك بابەتیانە و بە ویژدان لەم ئافرەتە دواوە.

## بیروباوەڕی تایفەی بابییە:

لە بیروباوەڕەکانی بابییەکان و کە پاشان بەهائیەیان لێکەوتەوە، باوەڕیان بە خودایەکی تاك و تەنیایەو ئەو زاتە ئەزەلی یەو بە بڕوای وان دەتوانێ لە لەشی مرۆڤێکی خاوێنی دینداردا بەرجەستە بێت. بە گوێرەی ئەحکامەکانی کتێبی (البیان) دەچنە ڕێوە, بۆیە بە (اهل البیان) دەناسرێن. ئەم تایفەیە ژمارەکانی (پێنج)و (نۆ)و (حەوت)یان لا پیرۆزەو قیبلەی وان (عکا)یەو نوێژی بەیانی و نیوەڕۆژیان هەیەو لەکاتی سەفەریشدا یەك سوژدەیەك دەبەن و نوێژی بە کۆمەڵیان نییە ، مرۆی بە تەمەن و نەخۆش و ئافرەتی بێنوێژ، نوێژیان لەسەر نییە . هەروەها رۆژویان ١٩ رۆژە کە دەکاتە مانگێك لە مانگەکانی بابی، مەی خواردنەوەو جگەرەکێشانیان لا حەرامە ، زۆر بە

ئـەدەب و رەوشـتن،گەلێك سـەخی و دەسـت بـڵاون و هـاوڕێتی و هاوسـێتیان خۆشـە و لـە کـاری ئـاژاوە دوورن . شـایانی باسـە بابییـەکان زۆر گرنگـی بـە ڕۆڵـی ئـافرەت دەدەن و دان بـە مافەکانیانـدا دەنـێن و بۆشـیان هەیـە و ماوەیـان پـێ دراوە ببنـە باڵادەست لە کاروباری ئایینی تایفەکەیاندا (٣٢) .

## نووسراوەکانی (باب):-

لە نووسـراوەکانی حـەزرەتی (بـاب – سـەید عـەلی محەمـەد) وا فام دەکرێ کە ئەم زاتە زیاتر باسی و ئامـانجی بنـەڕتی گفتـەکانی سەبارەت بە مەدحو سیفەتی ئەو حەقیقەتەیە کە پێی گەیشتووە ، نیـشانەو مەبەسـتی خۆشەویـستی لـە وتارەکانیـدا دەتکـا ، جگـە لـەوەی خـۆی بـە مـژدەدەرێکی ئـەوو هەسـتی خـۆی بـە واسیتەی دەرکـەوتنی کـەماڵاتێکی هەرەگـەورە دەدایـە قەڵـەم ، بـڕوای بـە گەڕانـەوەی ڕۆح – دۆنـای دۆن هـەبووە (٣٣) . بۆیـە هەنـدێ جـار خۆی بە (مەهدی چاوەڕوانکار) دەهاتە پێش چاو ، سەرچاوەیەکی ژێـر دەسـتم ڕەنگـە لـە ناویانـدا ژیـابێ و شـارەزایان بـووبێ زۆر ستایشی ئەم زاتە دەکات و دەڵێ شەوو ڕۆژ لـە خـەڵوەت و ریـازەت کێشاندا بـووە ، بـە موریـدانی خـۆی ڕاگەیانـدووە کەچاوەڕوانی دەرکەوتنی ئەو بن ، نووسینەکانی باب لە لایـەن موریدانیـەوە بـە وەحی ئاسمانی تەماشا کراوەو لە دڵی یارانیدا خۆشەویست بـووە ،

لە روی خۆشەویستی و ئەدەب و ئەرکانەوە بە موریدانی خۆی وتووە دەبێ زۆر بێ وێنە بن و لە ناو خۆتاندا تۆی زانست و زانیاری و هونەر و سەنعەتی سوود بەخش بێننە ئاراوە ، لە خەزینەی یارانەوە دەبێ پێداویستی برسیان و هەتیوان و بێوەژنان و نەخۆش و پەککەوتە بدرێت و سوالکردن لە ناو یارانی بابییە قەدەغە بکرێ و نابێ بە هیچ جۆرێ مادده سڕکەرەکان بەکار بهێندرێ(٣٤) .

باب لەبەر ئەوەی دەیگوت ئەز (باب المهدی – دەرگای مەهدی)مو ماوەیەك لەسەر ئەم بانگەوازەی بەردەوام بوو ، پاشان رێورچەیەکی ئایینی پێکەوە نا کە لە راستیدا لە گەڵ دەوروبەریدا نە دەگونجا . هەروەها ئەو چەندین نازناوی هەبوو لەوانە (باب الدین – دەرگای ئاین) ، (نقطة) و سازندەی خەڵقانی بە خۆ بەخشیوەو خۆی بە شوێنی دەرکەوتنی جیلوەی هەق و خوداوەند دەزانی بۆ ئەم مەبەستەش چەندین کەسانی لە یارانی خۆی بەرەو شوێنانی جودا رەوانە کرد ، دوای ئەوەی هەر جارە بە ناوو نازناوێکەوە لەلایەن خۆی و یارانییەوە دەناسراو بەو خەڵکانەیان رادەگەیاند کە ئەم زاتە زاتی مەهدییەو رۆحی ئەو لە لەشی ئەمدا جێگیر بووە ، وەك وتمان ئەمەش لە کاتێکدا بووە خەڵکان لەو باوەڕەدا بوون کە حەزرەتی مەهدی ئاخر زەمان

دەگەڕێتەوە بەلاَم کەی وچ کات و لەچ شوێنێك ، بۆ کەس مەعلوم نەبوو . خەڵکانی مەزەوی دوازدە ئیمامی ئێران چەشنی موسڵمانی دی چاوەڕوانی ئەم ژوانەن ، ئەوانەی کە باوەڕیان بە گەڕانەوەی رۆحیش هەبوو – دۆنای دۆن – لە بیروباوەڕەکانی تایفە باتنی یەکانی ناوئێران کە دەست رۆی ئەو رۆژگارە بوون ، ئەم بیروباوەڕەی زهور کردنە لە ناو دڵ ومێشکی ئەوانیشدا چەسپابوو . بۆیە دەبینین کەسانێك هەبوون لە پێڕەوییانی بابییان خۆیان بە دۆنی ئیمام حەسەن یان حوسێن و کەسانی تر لە ئیمامان داوەتە قەڵەم (٣٥) .جا لەبەر نزیکی و لێکچوونی باوەڕی ئەم گرۆیە لەگەل بیروباوەڕی تایفەی (الشیخیە – شەیخییان) کە ئەمانیش گرۆیەکن لە شیعەی ئێران و دەست و پەیوەندەکانی شێخ ئەحمەدی ئەحسائی دەبینین کەسانێکی زۆر لە خەڵکانی ئێرانی خاوەن هەمان بیرەباوەڕو رێباز چوونەتە پیری بانگەوازی ئەم زاتەوە ، کاتێکیش ئەم پیاوە رووانی خەڵکان دێنە دەنگیەوە و بە گەرمی پێشوازی لە بانگهێشتەکەی دەکەن ، ئاوازەیەکی تری پەیدا کردوەو وەك پێغەمبەرێك هاتووەتە مەیدانەوە و بووتە خاوەنی کتێبی (البیان) (٣٦) ، ئەم زاتە سەید عەلی بابییە جگە لەوە خاوەن دەست و قەڵەمێکی بە پێز بووە ، سەرچاوەکان دەڵێن لە نووسیندا گەلەك خێرا بووە ئەم خێرا

نووسینەیـشی یـەکێك بـووە لـە مـوعجیزە بـەدەرەکانی و وای لێهاتووە نازنـاوی (الـذکر) لـە خـۆ بنێـت و پەناشـی بردوەتـە بـەر ئایەتە پیرۆزەکانی قورئـان و خـەڵکانێکی زۆری شـارەکانی ئێرانـی کەمەنــدکێش کردبــوو . وادیــارە سەرچــاوەکانی ژێــر دەســتم هەنـدێکیان بـە هـۆی تونـدی و تونـدڕەوی بـۆ مەزەوەگـەی بـە تایبەتی شیعییەکان گەڵێ شتی نـاڕواو ناڕاستی نووسیوەو داوەتـە پاڵ ئەم گرۆیـە کـە ئـەز پـێم باش نـەبوو باسیان لێوە بکەم. لە کتێبـی البهائیــە حقیقتهـا واهـدافها کـە لـە بنەڕەیـدا ماسـتەر نامەیەکە لێکوڵەر ضاری محمد حـەیانی دەربـارەی دامەزرێنـەری بابییە(عەلی محەمەد ڕەزای شیرازی) دەڵێ ئـەم پیاوە زۆر حـەزی لـە خـۆ ڕۆشـنبیر کـردن نـەبوو شـتێکی کـەمی لـە زمـانی عـەرەبی فێرببـوو، لەگـەڵ نـەحوی فارسـی... کاتێـك تەمـەنی گەیـشتە ١٧ سـاڵان یـەکێك لـە قوتابیـانی کـازمی ڕەشـتی پێـی گەیـشت بـە نێوی(جواد کەربەلایی تەباتەیی) وبیرۆکەی شـەیخییەی بـە گوێـدا دەدا و لەگەڵ چاوەڕوان کـراوی نادیـار – الغائـب المنتظـر، وای بـە مێشك و بیریا دەبرد کەوا دەردەکەوێت لە دەم و چاو وسـیمای کـە ئەم واتە محەمەد عـەلی شیرازی ئـەو زاتـە چاوەڕوان کراوەیـە کـە هەواڵ دراوە بە نزیکی دەرکەوتنی لە لایەن کازم ڕەشـتی و هـەروا لـە لایـەن شـێخ ئەحمـەدی ئەحـسائیەوە، لەمـەوە محەمـەد عـەلی

شـيرازی ئـەم هەواڵـە کـاری تێکـرد(ل ٤٤ - ٤٥) هـەروەها نووسـەر دەڵـێ(عـەلی محەمـەدی شیرازی) بـە هـۆی گـوێ گـرتن لەوانـەکانی رەشتی و ریازەت کێشانی سەختی بـاتنی هەسـتی دەکـرد کە ئەو ئەوزاتەیـە کە روحـی مەهـدی نادیـار کە سـەر لـە نـوێ لـە دایـك دەبێتـەوە و جیهـان پـڕ لـە عەدالـەت و یەکـسانی دەکـات ئـەم خۆیەتی. زۆر جاریش سەید کازمی رەشتی ئامـاژە و کینایـەتی بـۆ دەکرد کەوا (مەهدی)بریتیە لە عەلی محەمەدی شیرازی. دەڵێنیش کـە رۆژێکیـان عـەلی محەمـەدی شـیرازی لای دانیـشتبوو، تیـشکی خـۆریش لـە لای ئـەوەوە دەهاتـە ژوورێ رەشـتی پێـی گـوت(خـاوەن فرمـان – ولی الامـر) هـەڵاتووە وەکـو ئـەم خـۆرەی لـەم دەرگایـەوە ئـەم ژوورەی رونـاك کردوەتـەوە، ئیـشارەتی بـۆ کـردوو خـەڵکانی ئامادە بوویش لە مەبەستی تێگەیشتن کە مەبەست لە میرزا عـەلی محەمەدە بروانە ل ٤٦

بـەڵام ئـەم لێکۆڵـەرە لـە بەشـی البهائیـە والنـصرانیة ل ١٤٨ دەنووسـێت پەیوەندیـەکانی بـەهائیان بـە نەصـرانیەکانەوە لـەو کاتەوە دەست پێدەکات کاتێـك عـەلی محەمـەد شـیرازی (بـاب)هاتـە کەربـەلا ولـە کـۆڕی دەرس وتنـەوەی(کـازم رەشـتی)پێـشەوای شـەیخییاندا ئامـادە دەبـوو، وەیـەکانگیر بـوونی لەگـەڵ سـیخوڕی ناسراوی رووسی(کنیازد گورگی)کە ناوی خۆی گۆڕی بوو بە (شێخ

عیسای نەکرانی)کە لە یاداشتەکانیدا هاتووە دەڵێت: خەریکی کنەو گەڕان و پشکنین بوو بە دوای لادەران لە بیروباوەڕەکانی ئیسلامیدا بۆ لێدانی موسڵمانان لەوانە لێدانێك بێت لە سەر یەکگرتنیان و کۆکردنەوەیان بۆ ئەوە سانا ترین رێگای گەیشتن بۆ دروست کردنی جیاوازی ئاینی و بلاوکردنەوەی بوو، هەڵگیرساندنی شەڕ بوو لە نیوانیاندا، لەم گەڕان و پشکنینەدا سەرنجم دایە تایەفەی شەیخییە کەوا پێچەوانەی زۆرێك لە بیروباوەری ئیسلام بوون جیگریش بوو لای زۆرینەیان، لەوانە گەڕانەوە و میعراجی جیسمانی وشتی تریش، چوومە بازنەی وانە وتنەوەی کازم رەشتی کە زۆر نێوی مەهدی دەبردو بەلام نەك ئەو مەهدییەی کە چەند سەدەیەکە چاوەڕوانی گەڕانەوەین: بەڵکو ئەوەی کە روحی تێدا جێگر دەبێت... لەوکۆڕەدا چاوم کەوتە میرزا عەلی محەمەدی شیرازی ولە دڵی خۆمدا وام لێکدایەوە کە ئەم بکەمە ئەو مەهدییە ناوبراوە لەو رۆژەوە دەستم پێکرد هەر کاتێك هەلێکم بۆ برەخسایە و کەسێك نەبوایە وام دەبردە مێشکیەوە هەر ئەوە کە دەبێتە ساحێب زەمان و هەموو رۆژێك بانگم دەکرد بە(ئەی خاوەنی فرمان – یا صاحب الامر، وە یا خاوەنی زەمان) لە سەرەتادا دەستی کردە خۆ بەرز کردن و خۆ نزم گرتن بەم قسانەی منەو خۆی دەگۆڕی و

بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو دەستی کردە شادی و خۆشی بەم بانگ کردنانەم لێی. پاش گواستنەوەی لە کەربەلاوە بۆ(بوشەهر) لە ناکاوێکدا سەرسام بووم بەو خیتابەی لە مانگی مایو ١٨٤٤م کە ئاگادارم دەکات و داوام لێدەکات بۆ رێزی بابییە بەوەی ئەو جێگری خاوەنی عەسرە و (دەرگا - باب)ی عیلمە، منیش وەڵامم دایەوە کەوا بڕوام هەیە تۆ ((ساحیبی زەمان وئیمامی عەصری)) ئەمە پوختەی ئەو سیخورە رووسەیە کە لە یاداشتەکانیدا ئاماژەی پێداوە، بەڵام نە دەبوو لێکۆڵەر زۆر بڕوای ئەم قسانە هەبوایە چونکە یەکەم جواد کە ربەلایی قوتابی رەشتی پێشتر وەك لێکۆڵەر خۆی دەڵێ ل ٤٤ بیرۆکەی شەیخییەی بە گوێدا سرواند پێی وت ئەم دەم و چاو سیمایەی تۆ ئەو زاتە چاوەڕوان کراوەیە کە کازم رەشتی هەواڵی داوە لەم نزیکانە دەردەکەوێت جگە لە شێخ ئەحمەدی ئەحسائی هەروەها لێکۆڵەر نووسیویە زۆر جاریش سەید کازمی رەشتی هێماو ئاماژەی بۆ عەلی محەمەد شیرازی کردوە کەوا هەر ئەوە ئەو مەهدی چاوەڕوانکراوە ل ٤٥ ئیتر نازانم لێکۆڵەر بۆ خۆی دەخاتە هەڵەوە رەنگە ئەم سیخوڕە چاوی بە(باب – عەلی محەمەد) نەکەوتبێ تەنها(حوسێن بەهائی) ناسیبێ پەیوەندی بەوەوە هەبووبێ رەنگە هەر ئەویش دەسکاری کتێبەکانی بەهائیانی کردبێ وەك خۆی دەڵێ لە یاداشتەکانیدا.

رەنگە ئەوەیش زۆر لە راستیەوە دووربێ کە (باب) شارەزای زمانی عەرەبی نەبووبێت چونکە کتێبەکانی گواهی ئەوە دەدەن کە ئەو بالاّ دەست بووە لەو زمانەدا ئەگەر چی پاش خۆی هەڵەی تێدا دەبینرێ چونکە لێکۆڵەر لە ل ٥٨ دا ئەڵێ کتێبی(بەیان)ی پیرۆزی بابییان پڕن لە هێماو ئاماژە گەلێك چەشنی زانایانی عیلمی کەلام و فەیلەسوفان بە کاریان دێنن!(٣٧) بەلاّم ئەوەش دیارە ئەم گرۆیە لەگەل تەشەنە سەندنی بیروباوەڕیان لە خاکی ئێران دا حکومەتی شاهانی هێنابووە لەرزین ، بۆیە زۆر بە توندی بەرەنگاریان بوونەتەوە ، ئەمانیش بە شمشێرێکەوە پەلاماری سوپایان داوە ، لەو باوەڕەشدا بوونە لەم بەرەنگار بوونەوەیەدا ئەوەی لێیان بمرێ لە پاش چل رۆژ سەر لە نوێ لە دایك دەبێتەوە ، سەید عەلی بابی لە هەندێك لە نامەکانیدا ئاماژەی بەوە داوە کەلە پاش مردنی خۆی لاوێك شوێنی دەگرێتەوە بە نازناوی (صبح أزل – سوبح ئەزەل)پەیدا دەبێت و یەکێکە لە یارانی . بەڵێ پاش خۆی سوبح ئەزەل لە خاکی ئێران هەلاّت و رووی کردە شاری بەغدا لەگەل (حوسێنی عەلی )برای کە نازناوی (بەهاء – بەهائوڵلاّ )بوو ، ئەمانە کە هاتنە بەغدا چەندین دەست و پەیوەندیان لە گەڵدا بوو ، بەم هۆیەوە هەردوو دەوڵەتی ئێران و عێراق رێکەوتن بە دەرکردنیان لە بەغداو دووبەرەکێش

کەوتە نێوانی ئەم گرۆیە ، بۆیە لایەنگرانی سەید عەلی باب بە (البابیة)و لایەنگرانی حوسێن عەلی بە (البهائیة) ناو زەدکران. ئەگەر بەراوردی ئایینی بابییە بکرێ لە گەل ئایینەکانی موسڵمان و فەلەو جولوکەو زەردەشتی ، دەبینین گەلەك بیروباوەڕی ئەم ئایینانەی تێکەڵ بووەو بەڕای هەندێ لە نووسەران و نزیکایەتی هەیە لە قسەو وتەکانی فەلەکان لەگەل بیروباوەڕی بابییە بەوەی جێگیر بوونی خودا لە جەستەی بەندەکانی (ناسوت)و ئەشڵێن بە چاکەو خراپەی روحەکان پاش بەجێ هێشتنی قاڵبەکانیان پاداشتی روح پاکان وخراپان دەدرێتەوە ، روحە خراپەکان ئازار دەچێژن تاکو پاك ببنەوەو بگەڕێنەوە سەر دۆخی جارانیان دیارە ئەمەش جۆرێکە لە فەلسەفەی دۆنای دۆن (٣٨) . بەلای منەوە بەشێکە لە داب ونەرێت و بیرۆکەی ئایینە باتنی یەکانی کوردستان و ئێران و پەیوەندی بە فەلەکانەوە نییە. سەرچاوەیەك دەڵێ : نوێژکردنی گرۆی بابییە تەنیا دوو کرنۆش بردنە ئەویش هەر لە دەمی بەیانیانە ، هەندێ جار ئەم کارەش تەنیا لە مزگەوتی شیرازدا ئەنجام دراوە ، چونکە بە کابەی خۆیانیان زانیوە ، مانگەکانیان بریتی یە لە ١٩ رۆژ و لەیەك مانگیان بە رۆژوو دەبن ئەویش لە کۆتایی بورجی (حوت – نەهەنگ)دا بە جۆرێك جێژنی رۆژوویان بکەوێتە رۆژی نەورۆز

که یەکەمی بورجی (حەمەل – شەك )ە. لە راوبۆچونیان گوێ نەدانــە قەبرســتان و نەخواردنـــەوەی مـــەی و جگەرەکێــشان و ئافرەتیشیان تا رادەیەك سەربەستەو بۆی هەیە سەرپۆش و پەچە نـەکات هـەروەکوخاتو(قورەتولعـەین) کـە چارشـێوی خـۆی فـڕێ دا(٣٩)

وەك وتمان بەهائیە چەکەرە کردووی بیروباوەڕی بابییەکانـەو (سەید عەلی محمەدی باب )، نازناوی (بەهائوڵلا)ی بەخشیبوو بـە (مـیرزا حوسـێن عــەلی بــەهائی) کـە نــاوی براکەیــشی (ســوبح ئەزەل)بووە ، پێم باشە لە داوێنـی ئـەم باسـەوە هەنـدێ زانیـاری دەربارەی ئەم بەهائییانە تۆمار بکەیین.

**بەهائییەکان:**

بـەهاییان گرۆیـەك بـوون سـەر بـە حوسێن عـەلی کوڕی مـیرزا عەباسی مازندەرانی نازناو بە (بـەهاء – بـەهائوڵلا)، ئـەم زاتـە لـە رۆژی سێـشەممە ٢٦ محـەرەمی سـاڵی ١٢٣٣ ك – ١٨١٧ م هاتووەتـە دنیاوە باوکی بە هاء کە ناوی مـیرزا عەباسـی بزورگـی نـوری بـوو، فەرمانبەری وەزارەتی دارایی ئەو دەمەی ئێران بـوو، نێـوی دایکـی بە هاء (خـانم جـانی)یـە . ئـەم پیـاوە بـەهائوڵلا گـەلێك هـاودەمی سـۆفییان بـووەو زۆر لـە کتێبـەکانیانی بەسـەر کردبـووەوە ، لـە

ئەنجامدا بەلای سەید عەلی (باب)دا بایدایەوە بە هۆی ئیرشادو رێنموونی کردنی لە لایەن عەبدولکەریمی قەزوینییەوە ، سەرەتا لە تاران دەستی کردە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی (باب)و پاشان خۆی گەیاندە مازندەران و دەستی کردە بانگهێشتی خەڵکان بۆ بیروباوەڕی (بابییان)و هەر لە شارۆچکەی (نور)ەوە گرتی تا دەگاتە شارۆچکەکانی(ساریّ و ئامل) و پاشان گەڕایەوە بۆ تاران لە زەمانی (محەمەد شای ئێران)و پاشان (ناصرەدین شاه )شۆڕش و بزاڤی بابییە دەستیان پێکردو لەم کاتانەشدا بوو (محەمەد صادق بابی)و هاوڕێیانی هێرشیان بردە سەر (شاه – سوڵتان) لە تەنیشتی قەسرەکەی لە (نیاوران)ی دەوروبەری (شەمران) لە تاراندا . بەهائوڵلاّ و براکانی لەم کاتەدا لە گوندێك بوون بە ناوی (کەفجە)ی نزیك لە میوانخانەی(شاه)و بۆ ئەم مەبەستە بەهاء تۆمەت بارکرا بەوەی کە دەستی هەبووە لە نەخشە کێشان بۆ کوشتنی شاه ، لەبەر ئەمە دەمودەست هەستان بەهایان گرت و لە تاران خرایە زیندانەوە ، پاشان لەگەل کۆمەڵێك لە پەیڕەوانی بەرەو بەغدا دوور خرانەوە (٤٠) .

لە پێناسەی بەهاییاندا گەلێ راوبۆچوون هەیە و هەر یەکێك لە نووسەران و لێکۆڵەران بە جۆرێکیان پێناسە کردووە لەوانە وتراوە : مەزەوێکی ئایینی کۆمەڵایەتییە دەدرێتە پاڵ (میرزا

حوسێن عەلی – نازناو بە بەهائوڵلاّ) کە لە کەسە یەکەمەکان بووە بڕوای بە (باب – میرزا عەلی محەمەدی شیرازی) هێنابوو ، لەبەر ئەمەشە رێبازی بەهائییە بە برەوپێدانی بابییە دێتە ئەژماردن (٤١).

دکتۆر عەلی وەردی دەڵێ : بەهائوڵلاّ خاوەن کەسایەتییەکی کۆمەلاّیەتی ودەوڵەمەندێکی تاران بوو ، لە ساڵی ١٨٥٢ م. کاتێك هەندێ کەسی بابییان هەستان بە کوشتنی شاە ، بەهاء یەکێك بوو لەوانەی تۆمەتبار کراو بۆ ماوەی چوار مانگ خرایە زیندانەوە ، پاشان بەرەڵلاّ کراو بە خۆی و بنەماڵەکەیەوە بۆ عێراق دوورخرایەوە ، ساڵی ١٨٥٣ م گەیشتە بەغدا پاش ماوەیەك براکەیشی هاتە بەغدا کە ناوی میرزا یەحیای نازناو بە (صبح ازل – سوبح ئەزەل)و لە ناو بابییەکاندا بەوە ناسرابوو کەراسپاردەو جێگری (باب)ە (٤٢)

وادیارە بەهاو(سوبح ئەزەل)ی برای نێوانیان تێکدەچێ لەسەر مەسەلەی کامیان راسپاردەو جێگری حەزرەتی(باب)بێ و باب کامیانی بەم ئەرکە راسپاردوە ، کار دەگاتە ئەوەی گێرەوکێشەی ئەم بابەتە هەستیارە بکەوێتە ناو موریدانیان و مشتومڕێ زۆری لێدەکەوێتەوە لە شارەکانی کەربەلاو بەغدا تاکو وای لێدێت بەهائوڵلاّ بەغدا بەجێ بێڵێ و خۆی بگەێنێتە( کوردستانی

عوسمانی – باشووری کوردستان – ھ .ك.)بە جل وبەرگی دەروێشان و کەشکۆڵ بەدەست و ناوی خۆی دەگۆڕێت بە (دەرویش محەمەد)و دەچێتە سلێمانی و لە شاخەکانی (سەرگەڵو) گۆشەگیر دەبێ و پاشماوەیەك دەچێتە ناو شاری سلێمانی بۆ (تەکییەی خالدییە – مەبەست تەکییەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی شارەزووری یە- ھ.ك. )و دوو ساڵی تێدا بەسەر دەبات(٤٣). کەچی پارێزەر عەباس عەزاوی دەڵێ: ساڵی ١٢٦٧ ك/ ١٨٥٠ م (حوسێن عەلی کوڕی عەباسی نوری) ھاتە عێراقەوە بە نیازی سەردانی شوێنە پیرۆزەکانی و لە بەغدا گیرسایەوە ، ماوەیەك لە سلێمانیدا خۆی پەناداو چووە شاخەکانی سەرگەڵو پاشان گەڕایەوە بۆ بەغدا )) (٤٤) .

بەلاّم لە (دائرة المعارف الاعلمی)دا دەڵێ : پاش ماوەی ساڵێك لە دورخستنەوەی بە جل وبەرگی دەرویشانەوە گەڕایەوە بۆ تاران لە ترسی حکومەتی ئێران و ئەشڵێن چووەتە کوردستان و ناوچەی سەرگەڵوی نزیکی شارەزوور لە سلێمانی و بەجل وبەرگی دەرویشانەوە لە کۆڕوکۆبوونەوەی (عبدالرحمن ئەلصوفی-گەورەی تەریقەتی خالدیە)ئامادە بووە تا دوو ساڵ و پاشان گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا لەلایەن ھەندێك لە یارانیەوە))(٤٥).

مامۆستا عەبدولرەقیب یوسف لە گۆڤاری رامان دا چەند بەلگەنامەو لابەرەیەکی بنەماڵەی(مەلا محەمەدی سەرباری)بلاوکردوەتەوە یەکێکیان(مهدینامە)یە لە دەسنووس محەمەد دەروێش لە ساڵی ١٢٧٦ کۆچی(١٨٥٩ – ١٨٨٦م)کە لە ئەشکەوتێك لە ئەشکەوتەکانی دێی سەرگەڵو لە باکووری سلێمانی دیارە ئەو ئەشکەوتە هەمان ئەشکەوتە بهاء الله دامەزرێنەری بیروباوەڕی بەهایی تێدا بووە، مامۆستا عەبدولرەقیب دەڵێ دیارە محەمەد دەروێش مەلایەکی کوردی بەهائی بووە و رەفیقی (بهاء الله)میرزا حوسێن عەلی میرزا عەباسی مازندەرانی) بووە، لەو ئەشکەوتی دێر سەرگەڵوودا کە بەهائوڵلا لە ترسی دەوڵەتی عوسمانی خۆی لەوێ حەشاردا بوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بچم بۆ دێی سەرگەڵو بۆ دەست نیشان کردنی ئەو ئەشکەوتەی ئێستا پێی دەڵێن(ئەشکەوتی بەهاوەددین) هەروەها نووسەر وێنەیەکی بلاوکردوەتەوە))(٤٦) بەلام ئەز وای بۆدەچم محەمەد دەروێش حەزرەتی بەهائوڵلا خۆیەتی چونکە ئەو ناوەی لەخۆ نابوو کاتی هاتوەتە سلێمانی و سەرگەڵو گەرچی دوو ساڵ جیاوازی لە مێژووکەیدا هەیە. لە کتێبی (بەهائوڵلا لە کوردستان) هاتوە کە لە ١٠ی ئاپریلی ساڵی ١٨٥٤م حەزرەتی بەهائوڵلا بێ ئاگادارکردنەوەی کەس لە بەغداوە لە گەل

هاورِییەكی وەفاداری بە نێوی ئەبوالقاسم هەمەدانی بەرەو كوردستان هاتون بۆ شاری سلێمانی و تەمەنی بەهائوڵلاّ ٣٨ ساڵان بووە,بەناوی دەروێش محەمەدو كەشكۆڵێكی بە دەستەوە بووە لە شاخی سەرگەڵو مایەوە,لای شێخ و عارفەكانی كوردستان هەر بەو ناوە ناسرا,شێخ ئەحمەدی سەردار سەرگەڵویی بەهۆی چەند كەسێكەوە زانی دەروێشێك لە یەكیك لە ئەشكەوتەكانی دێی سەرگەڵو لە خەڵوەتدایە,چوە دیداری حەزرەتو پاشان بردیە خانەقا بچوكەكەی خۆی لە سەرگەڵو و خزمەتی كردو بوون بەهاورێو بە هۆی شێخ ئەحمەد سەردارەوە چونەتە سلێمانی ولە خانەقای مەولانا خالید نیشتەجێ بووە بڕوانە ل١١٢ ١١٨,١١٤ كتێبەكە بە پێی هەندێ بۆچوون ئەگەری ئەوە هەیە گۆركی جاسوسی رووسیا ئەم شوێنەی سەرگەڵوی بۆ بەهائوڵلاّ دەستنیشان كردبێ چونكە پێشتر لە بەغداد ئەوی بینوە,لەم بۆچونەیشەوە پێدەچێ پەیدا بوونی حەمەسوورلە دوای ماوەیەكی زۆر لەم ناوچەیە دەستی روسیای تێدا بێت كە قسەو باسێكی زۆر لەم بارەیەوە هەیە.

كاتێ یارانی بەها بە جێوماوای دەزانن دەچنە لای و تكای لێدەكەن كە بگەڕێتەوە بۆ كەربەلا ، بەهائوڵلاّ بە گوێیان دەكاو لە ١٩ ئاداری ١٨٥٦ م گەڕاوەتەوە بەغداو دوایش توانیویەتی ئەو

گێـرەو كێـشەیە كۆتـایی پـێ بهێنێـت و بابییـان یەكخاتـەوە ، گرۆتینیان پێ بدات . ئەم پیاوە واتـە بـەهائوڵلا پەیوەنـدی باشـی هـەبووە لـە گـەل پیـاوانی خـاوەن دەسـەلات و زاناكـانی بەغـداو قونصولی بەریتانیا ، بۆیە دەبینین چەندێ بابییان لە ئێران ئـازار درابــن ، هــەلاتوون خۆیــان گەیاندووەتــە بەغــداو ژمارەیــان گەیشتووەتە ٥ هەزار كەس بابی و توانیشیان لە عێراقدا بـرەو بـە بیروباوەڕەكەیان بدەن (٤٧) . لەبەر ئـەوەی زۆربـەی سەرچاوەكان ئاماژە بەوە دەدەن كە بهائوڵلا گەیـشتووەتە كوردستانی عێـراق و ناوچـەی سـەرگەلۆ بـە تایبـەتی ، لـەم روانگەیـەوە بەنـدە وای بـۆ دەچم كە بیروباوەڕی هەقەی سـەرگەلۆیش گـەلێك دێـرین بێـت و پـەنا بردنـی بـەهاء لـە مێـژووی ١٨٥٠ م بـۆ شـاخەكانی سـەرگەلۆ راستی ئەم بۆچوونەن و هەندی لـە بیروبـاوەڕی بابییـە رەنگـە لـە ناو خەڵكانی ئـەو دەڤـەرە مابێتـەوە ، لەوانەیـشە ئـەم بیروبـاوەڕی بەهائییە كاری كردبێتە سەر كەسایەتییەكانی ناو حەقە كاتێ بـە ئاشكرا دەركەوت ، بە تایبەتی شێخانی تەریقەتەكە كـە ماوەیـەك سەرگەرمی لێكدانـەوەی بـڕێ لـە ئایەتـەكانی قورئـان بـوون وەكـو بابییەكان شیتەڵ و راڤـەیان دەكـردەوە ، بـە تایبـەت لەمـەڕ جـێ بەجێ نـەكردنی تەكالیفـە شـەرعیەكانی وەكـو نوێـژ كـە دەیـانوت ئێمە پێویستمان بە نوێژ كردن نییـە و ئـەم ئایەتـەیان بـە نمونـە

هێناوەتەوە کە دەفەرمێ (واسجد لربك حتی يأتيك اليقين )وبەم جۆرەشیان لێکداوەتەوە (حتی: ئەداتی بلوغی غایەیە ، ئێمە گەیشتووینەتە غایە ، یەقینمان پەیدا کردوە پێویستمان بە سوجدە نی یە )) (٤٨) .

(بەهائوڵلاّ )یش لە (بێستانی نەجیبییە)ی بەغدادا بە یارانی خۆی راگەیاند کە ئەو یەکێکە لە مەزهەرەکانی خودا بە گوێرەی فەرمایشتەکانی (باب - سەید عەلی)ناوی خۆی بە (بەهاء)ناساند ، پاشان دەست بەرداری هەندێ لە تەکالیفەکانی شەرع بوون چەشنی بیروباوەڕەکانی تری باتنی یەکان و سۆفییە بەرزەفڕەکانی لەم بوارەدا (٤٩).

کاتی بەهاء گەیشتە شاری بەغدا خەڵکی بۆ چاوپێکەوتن و گوێ گرتن لە قسەو وتارەکانی پۆل پۆل دەهاتنە دیدەنی لە موسڵمان و فەلەو جولەکە وتارەکانی کاری تێکردبوون ، بەلاّم وادیارە زانایانی بەغدا ئەم کارەیان بە مەترسی زانیوە بۆیە هەرجارەی بە بیانوویەك هێرشیان کردووەتە سەرو لای خەڵکان ئابڕویان بردوە ، پاشان سوڵتانی عوسمانی و شای ئێران خۆشکەری ئەم ئاگرە بوونە بۆ سەرکوت کردنی ئەم جولاّنەوەیەو لە باربردنی . لە دوای وتووێژ لە نێوانی ئێران و عوسمانیان لەسەر داوای حکومەتی شاە لە( بابی عالییەوە)

فەرمانێك دەردەكرێ بە دوورخستەوەی حوسێن بەهایی و یارانی لە بەغداوە بۆ ئەستەمولّ (٥٠) .

لە رۆژی ٢١ نەورۆزی ساڵی ١٨٦٣ م حوسێن بەهایی ویارانی ئاهەنگی جەژنی نەورۆزیان لە بێستانی (وەشاش) نزیك بەغدا دەگێڕاو لەم كاتەدا بوو نیردراوێكی نامیق پاشا دێتە لای حوسێن بەهایی كە سەردانی سەرای حكومەت بكات لە مەڕ كارێكی گرنگەوە ، بۆ بەیانی بەهاء چووە سەرای ، نامەیەكیان دایێ كە لە (صدر الاعظم)وە بۆی هاتبوو كە بانگهێشت كراوە بۆ ئەستەمولّ و بڕێ پارەشیان دایێ بۆ خەرجی رێگاو بان ، پاش مانگێك بەهاو بڕێ یارانی كەوتنە رێ و لە رێگای (كەركوك – موسلّ – دیار بەكر)ەوە گەیشتنە ئەستەمولّ و پاش چوار مانگ حكومەتی عوسمانی بردیانیە شاری( ئەدرنە)و لێرەدا ئاژاوە كەوتە نێوان بەهاو(صبح ازل)ی برای سەبارەت سەرۆكایەتی كردنی بابییان و كۆتایی كێشەكەیش هات بە بوونیان بە دوو بەشەوە ، گرۆیەكیان ئەوانەی كەوتنە شوێن بەهاء ناونران (بهائیه)و ئەوانی تریش كە بوونە لایەنگری (صبح ازل) ناونران (الازلیه)(٥١) .

لە ساڵی ١٨٦٨ م حكومەتی عوسمانی و سەفارەتی ئێران رێككەوتن بەجیاكردنەوەی ئەم دوو گرۆیەو بۆئەم مەبەستە

بـەهائوڵڵاو یـارانی کـەژمارەیان ٦٨ کـەس بـوو ، رەوانـەی شـاری (عـەکا) کـران و سـوبح ئـەزەل و یـارانی کـە ٢٠ کـەس دەبـوون نێردرانە (دوورگەی قوبرص) . لە ٢٨ ئایاری ١٨٩٢ م بـەهائوڵڵا لـە (عەکا) کۆچی دوایی دەکات کە تەمەنی٧٥ ساڵان بوو(٥٢) .

لـەپاش کۆچـی دوایـی حوسێن بـەهایی چـەند نووسـراوێك بـە جێمان لەوانە (الایقان)و(جواهر الاسرار )و (الاقدس) و (الطرزات) و(الاشراقیات )و(الالواح)و(الکلمات المکنونە)، بەڵام سـەیر لەوەدایـە سەرچـاوەکانی بەهائییـە دەڵـێن (( ئـەم زاتـە نەچـووەتە هـیچ خوێندنگایـەك تـەنیا ئـەو خوێندنـەوە کەمـەی نـەبێ کـە بریتـی بـووە لـە چـەند دەرسـێك لـە ماڵـەوە فێـر کـراوە ، لـە منداڵییـەوە هۆشمەندو زیرەك و بلیمـەت بـووە ،جگـە لـەوەی کەمەندکێشێکی مەعنەوی وای بووە کەسانێکی زۆری کەمەندکێشی خـۆی کـردوە ، لە مێژووی ١٨٤٤ م کە (باب) دەستی کردە بڵاوکردنەوەی دەعـوەتی خۆی بەهائوڵڵا ئەو کاتە تەمەن ٢٠ سڵان بووە )) (٥٣) .

پـاش کۆچـی بـەهائوڵڵا کـوڕە گەورەکـەی ، عـەباس ئەفەنـدی نازنـاو بـە عبـدالبهاء)بـووە جێنـشینی و سەرپەرشـتی بـەهائیانی گرتـە دەسـت و تـوانی لـە ماوەیـەکی کورتـدا تایەفـەی بەهائییـە بـەرەو پێـشەوە بـەرێت وبزاڤەکـەی لـە بزاڤێکـی نـاو خـۆوە بکاتـە بزاڤێکی جیهانی و خەڵکان بانگهێشت بکاتە سەر بیروباوەڕەکانی .

شـایانی باسـه سـاڵی بەهائییـه دابـەش ببووەسـەر ١٩ مـانگ و هـەرمانگێکیش بەسـەر١٩رۆژدا و ئەمـەش نـاوی ١٩مانگەکەیانە(بهاء))، (جلاء)، (جمال) (عظمة)، (نـور)، (رحمة)، (كلمات)، (كمال)، (اسماء)، (عزة)، (مشية)، (علم)، (قدرة)، (قـول)، (مـسائل)، (شـرف)، (سـلطان)، (ملـك )، (عـلاً). هـەروەها نـاوی رۆژانـی هەفتەشـیان بـەم جـۆرە بـوو (حـلال)،(جـلال)، (كـمال)، (فضال)، (عدال)، (استجلال )(استقلال)(٥٤).

## ئایین و باوەڕی بەهاییان:

ئـایینی بـەهایی خـۆی بـە ئـایینێکی ئاسمـانی دەزانێـت و بانگهێشتی یەکتاپەرستی دەکات و کتـێبی پیرۆزی خۆی هەیە لە پەرستن و نوێژو رۆژووگرتن کە بانگهێشتکەری ئەم ئایینە نوێیـە مـیرزا حوسـێن عـەلی نـوری ناسـراو بـە بـەهائوڵلاً یـا حوسـێن بەهاییە.وەك دەڵێن لەم ئایینەدا کاهن و رەبەن و پیاوی ئـایینی و ئـەولیاو کەسـانی پـیرۆز نیـە,هـیچ مەراسـیمیکی ئـایینی لـە ئـارادا نیـە,لـە پەرسـتندا,بـەڵکو نوێـژی بـە تـەنێ بـەڕێوە دەچـێ، ئەحکامەکانیـشی زیـاتر گرنگـی بـە خاوێنکردنـەوەی نـاخی مرۆڤەکان دەدات نەك سزادانی ,بنـەمای پەرستنەکە بریتییـە لـە خۆشەویـستی خـوا, دان بـە هـەموو دینەکانـدا دەنـێن و هـەوڵی

یەکێتی مرۆڤەکانی دونیا دەدەن .لە سەر رۆژمێری خۆیان یەك مانگ رۆژی تێدا دەگیرێ لە هەندێ سەرچاوە ناوی ئەم مانگە بە (علا)هاتوە لە شوێنی تر بە مانگی بەهایی ناودەبرێت کە لە ٢ی مارس ئادار دەست پێدەکات هەتا ٢١مارس ئادار بۆیە بەهائیان مانگی نەورۆز و یەکەمین رۆژی سالّی تازەی کوردی بە پیرۆز رادەگرن.ئەم مانگە کۆتایی مانگەکانی بەهاییانە. لە کاتی بەرۆژو بوونیان خواردن ناخۆن هەر لە رۆژهەلاّت تا رۆژئاوا بوون لە رۆژی نەورۆز کۆتایی بە رۆژوەکانیان دەهێنن.(٥٥)

ئایینی بەهایی لە ولاّتانی رۆژهەلاّتی ناوین پەسەند ناکرێو گەلێ دژایەتی و بەوەش تاوانبار دەکرێن کە پەیوەندییان بە ئیسرائیل و دەولّەتانی داگیرکەری وەك رووسیاو بریتانیا هەبووەو ئەم ئایینە نوێیەیان بۆ دامەزراندون بۆ بەربەرەکانی موسلّمانان. بەلاّم بەهاییان ئەم تۆمەتانە دەدەنە دواوەو دەلّێن هیچ پەیوەندییان بە ئیسرائیلەوە نیە ,هەرچەندە شوێنە پیرۆزەکانیان دەکەوێتە ناو خاکی ئەو ولاّتەوە,چونکە بەهائوللاّ لەسالّی ١٨٦٨م بەفەرمانی خەلیفەی موسلّمانان سولّتان عبدالعزیز لە قەلاّی عەکا بەندکرا بە فیتی بالّیۆزی حکومەتی قاجاڕی و لەسالّی ١٨٩٢م لە دەوروبەری عەکا بەهائوللاّ کۆچی دوایی دەکات و لەوێ دەنێژرێ و ئەو جێگایەش دەبێتە قیبلەگای یارانی,بهاییان دەلّێن

ئێمە ٨٠ ساڵ بەرلە دروست بوونی دەوڵەتی جوولەکە نیشتەجێی ئەو شوێنانە بووین.جگە لەمە موسڵمانان بابییەو بەهاییەو سەرهەڵدانی بیروباوەڕەکەیان دەدەنە پاڵ سیخوڕی رووسی کیناز گۆرکی کە خۆی کردبووە موسڵمان و ناوی عیسای نەکرانی لەخۆ نابوو،لەکۆڕوکۆبوونەوە ئاینیەکانی کازمی ڕەشتی ئیمامی شەیخییاندا ئامادە دەبوولە شاری بەغدادو هەرلێرەشدا کاتێ سەیید عەلی محەمەد شیرازی دەهاتە ئەم کۆڕە ئایینیانەی سەیید کازمی رەشتی لێرەدا بوو ئەوی ناسی و بە مەهدی چاوەڕوانکراوی لە قەڵەم دا بۆ جودایی خستنە نێو موسڵمانان.

## ژمارە و شوێنی بوونیان:

زۆربەی پەیرەوانی بەهائیان لە سەرەتای دەرکەوتنیان کەوتبوونە ئێران، پاشان بە شێوەیەکی پەرتو بڵاو کەوتونەتە زۆر وڵات و هەرێمی جیا جیا تا ئێستا هیچ ئامارێکی وردو باوەڕ پێکراو لە بەر دەستدا نیە بۆ ئەوەی بسەلێنێ کە چەند لە پەیڕەوانی ئایینی بەهایی لە جیهاندا هەن بەڵام بە پێی هەندێ سەرچاوە بەهائیان زۆریان لە ئێراندا هەن کە بە دەیان هەزار کەس مەزندە دەکرێن جگە لەم وڵاتانەی عیراق و کوردستان و لوبنان و سوریا و فەلەستین و میسردا هەن (٥٦) ئەمڕۆ ئایینی بەهایی بووەتە ئاینێکی سەربەخۆی جیهانی و پەیڕەوانی لە(

٢٣٥)دەوڵەتـــدا بلاّوبونەتـــەوە, چـــەندین رەگـــەزی هەمـــەجۆری لـــەخۆگرتووە, لەبـــەر ئـــەم هۆیـــە سەرچـــاوەکانیان ئامـــاژەدەدەن کەژمارەیان لەم سەردەمەدا دەگاتە شەش ملیـۆن کـەس و زۆربـەی دەوڵـــەتانی جیهـــان دانیـــان پێـــداناون جگـــە لـــەوەیش یەکـــە ئیدارییـەکانیانی بیروباوەڕیـان بـە زوویـی بلاّودەبێتـەوە .کـە لـەم دوایەدا وڵاتی میسر دانی بە بوونیاندا ناو رێگا بـەو رێکخراوانـەی بەهائیان درا بە ئازادانە رێورەسم و داب و نـەریتی خۆیـان جێبـە جێ بکەن کە پێشتر وڵاتی میسر بە بڕیاری کۆماری ژمـارە(٢٦٣)ی سـاڵی ١٩٦٠ جێگـاو کـوڕو کۆبوونـەوەکانیان داخـست (٥٧) هـەروەها بـەهائیان لـە چـەند وڵاتێکـی ئـەفریقاش مـەحافلی خۆیـان هەیـە وەك لە ئەسیوپیا لـە شـاری ئـەدیس ئـەبابا، ئۆغەنـدا، زامبیـا کـە سـاڵی ١٩٨٩ کـۆنگرەی سـاڵانەی خۆیانیـان تێـدا بەسـت، باشـووری ئەفریقا لە شاری جوهانسبێرگ. لە سدنی ئوسترالیا، لـە لەنـدەن و پاریس. ڤیەنا و فرانکفۆرت و شاری شیکاگوێ ئەمریکا گەورەترین پەرسـتگەیان هەیـە پێـی دەڵـێن (مـشرق الاذکـار) ژمارەیـان لـە ئەمریکا بە یەك ملێون کەس زیاتر مەزنـدە دەکـرێ بـە سـەر ٦٠٠ کۆمەڵە دابەش بوونە.ئەوەی شایانی باسـە بـەهائیان نوێنـەرێکیان لـە رێکخـراوی نەتـەوە یەکگرتوکانـدا هەیـە بـە نـاوی (فیکتـو دی ئارخو)هەروەها لە رێکخراوەکانی ئـابوری نەتـەوە یـەکگرتوەکان و

ڕێکخـراوی ژینگـەو چاودێری دایـك و منـداڵ وجگـە لـە چـەندین ڕێکخـراوی تـر ئەنـدام نوێنەرایـەتی خۆیـان هەیـە لەگـەڵ چـەند سەندیکای تایبەت بە خۆیان(٥٨)

شایانی وتنە وەزارەتی نـاوخۆی عـیراق فرمانێـك دەردەکات بـە گوێرەی ئـەو فرمانـە هـەموو چالاکیەکانی بـەهائیان لـە عێراقـدا قەدەغە دەکات بە پشت بەستنی بە برگەی ١٦ لە مـاددەی چوارەم لە یاسای ئاسایـشی نیـشتمانی ژمـارە(٤)ی سـاڵی ١٩٦٥ بـۆ داخـستنی مـەکۆگاکانی بـەهائیان لـە عێـراق و دەسـت بـە سـەرا گرتنـی کەلوپەلـەکانیان. هـەروەها ڕژێمـی بـەعس لـە سـاڵی ١٩٧٠ بڕیـاری ژمارە(١٠٥)ی.

سـاڵی ١٩٧٠ بـە نـاوی (مجلـس قیـادة الثـورة) دەردەکـات بـۆ قەدەغەکردنی چالاکیەکانی بەهائیان کـە تێـدا هـاتووە نـابێ هـیچ کـەس ولایـەنێك چالاکی ئـەنجام بـدات وکـەس بـۆی نیـە کتێـب و بڵاوکراوەی بەهائیان بڵاوبکاتەوە (٥٩)

دەبیـــنین ئـــەمڕۆ بـــەهائیان لـــە ســـایتەکانەوە ڕونکردنـــەوەو بڵاوکراوەیان هەیە بەرامبەر بەو خەڵکانـەی دەیانـەوێ لـە ئـایینی بـەهائیان بگـەن یـان دژی دەنووسـن بـۆ نموونـە لـە سـایتێك بـە عـەرەبی نووسـراوێك بڵاوکراوەتـەوە بـە ناونیـشانی(حقـائق عـن الـدین البهـائی)(٦٠) . نووسـەر دەڵـێ ئـایینی بـەهائی ئـاینێکی

جیهانی سەر بە خۆیە و پەیڕەویانی زیاتر لە ٢٣٥ دەوڵەت بڵاوبوونەتەوە زیاتر لە ٢٣٠٠ رەگەزی جیاوازی لە خۆ گرتووە لە گەلانی سەر زەوی و ئاینێکی بەربڵاوە، بڕوای بە تاقە خوایەك هەیە لەگەڵ یەکسانی مرۆڤەکان و بڕوای بە هەموو ئایینە گەورەکان هەیەو سەرچاوەشیان خواییە و حاڵی حازر ژمارەی پەیرەوانیان ٦ ملیۆن کەس دەبێت و زۆربەی دەوڵەتان دان بە تەشکیلاتی ئیداری بەهائیان دا دەنێن و ئاینی بەهائی زۆربە خێرایی لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەوە بڵاودەبێتەوە. نوێیی ئەم ئایینەو نەچوونە بنج و بناواینەوە بە تایبەتی لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوین بوەتە هۆی پەیدا بوونی پروپاگەندە و نووسینێکی زۆری هەڵە لە بڵاوکراوە وکتێب و رۆژنامەکاندا. کە وابوو بەهائیان بەر پەرچی نووسینەکانی نەیارانیان دەدەنەوە و بەرگری لە ئاینەکەیان دەکەن بە هەر شێوەیك لە شێوەکان دەڵێن ئێمە یەکتا پەرستین و ئاینەکەمان ئاسمانیەو نوێژو رۆژو کتێبی پیرۆزی خۆمانمان هەیە ئەوانەی دەستگیری ئاینەکەمانن لە هەموو میللەتێکی تێدایە لە هەموو جۆرە زمان و کەلتورێك و چین وتوێژێك و لەمانەیش مەکۆگایەکی جیهانی و یەکگرتو پێك دێت و لە لایەن دەوڵەتانەوە رێزی لێدەگیرێ بەوەی رێکخراوێکی جیهانی یەو پەیوندی بە حکومەتەوە نیە.بەلای ئەو نووسەرەوە

بیروباوەڕی بەهائی یەکە ڕێگایەکە بۆ ڕزگار بوونی مرۆڤ و یەکێتی عالەم و چاودێری بەرژەوەندی هەموو مرۆڤەکان دەکات بە بێ جیاوازی. ئەم ئاینە لە کاتێکدا پەیدا بوو کە خەڵکان لەو باوەڕەدا بوون بە گەڕانەوەی مەسیح و سەرگەرمی دەرکەوتن (ساحیب زەمان) بوون هەردوو لا موسڵمان و فەلەیان لەو باوەڕەدا بوون کە چەرخێکی روحی نوێ دەست پێدەکات هەر وەك لە کتێب و بیروباوەڕەکانیاندا ئاماژەیان پێداوە.

شوێن وجێگاو ژمارەی بەهائیان لە عێراق و کوردستاندا:

بەهائیان بە زۆربەی لە شارەکانی وەك (دیالە - باقوبە)و (بەغدا) و(بەسرە) بە چڕی هەبوون و دەژیان‌بەڵام زۆر بە کەمی لە شارەکانی کەرکوك و هەولێر دەبیندران لە بەر دووری ئەم دوو شارە لە سنووری ئێرانەوە، ئەمەش خشتەی سەر ژمێری عێراق و کوردستانە ئەگەرچی ئەم سەر ژمێریە هی ساڵی ١٩٦٥ رێژەی بەهائیان دەست نیشان دەکات باسی لە بەهائیانی کەربەلاو سلێمانی نەکردوە(٦١)

| ناوی ناوچە | ژمارەی دانیشتوانی | ژ. بەهائیان | ڕێژەی |
|---|---|---|---|
| ١- دیالە/ئەبو سێدە | ١٨،٤٠٠ | ٤٦ | ٢٥و٠/٠ |
| ٢- بەغدا/کەرادە شەرقیە | ٢١،٢٥٠ | ٢٤١ | ٠٨و٠/٠ |
| ٣-بەغدا/ئەعزەمیە | ١٥٤،٢٨٥ | ١٠٨ | ٠٧و٠/٠ |
| ٤-بەغدا/ڕسافە | ٢٠١،٦٦٦ | ١٢١ | ٠٠٦و٠/٠ |
| ٥-هەولێر/مەرکەز | ٨٠،٠٠٠ | ٢٤ | ٠٣و٠/٠ |
| ٦-بەسرە/مەرکەز | ٢٦٠،٠٠٠ | ٧٨ | ٠٣و٠/٠ |
| ناوی ناوچە | ژمارەی دانیشتوانی | ژ. بەهائیان | ڕێژەی |
| ٧-دیالە/باقووبە | ٩٠،٠٠٠ | ١٨ | ٠٢و٠/٠ |
| ٨-بەغدا/کازمیە | ١٦٥،٠٠٠ | ٣٣ | ٠٢و٠/٠ |
| ٩-بەغدا/مەنسور | ٢٧٠،٠٠٠ | ٥٤ | ٠٢و٠/٠ |
| ١٠-کەرکوك/مەرکەز | ٢١٠،٠٠٠ | ٢١ | ٠١و٠/٠ |

## ئافرەتی بەهایی و یەکسانی:

ئایینی بەهایی بە یەکسانی دەڕوانێتە رەگەزی نێرو مێ ,بەهائوڵلاّ لەنووسینەکانیدا پیاوو ژنی بە دوو باڵی باڵندە چواندوە,کە بەم دوو باڵەوە نەبێ ناتوانن بەنێو ئاسمانی زانستەکانی بەهاییدا بفڕن و بگەنە ئامانجەکانیان,لەم ئایینەدا گرنگی بە مافی کوڕو کچ دەدرێ,بەڵام گرنگیەکی زیاتر بە کچان دەدرێت لە بواری پەروەردەو فێرکردن و زانست بەدەست هێنانداچونکه لە پاشەڕۆژدا دەبێتە یەکەم مامۆستای منداڵانی ,بەهائوڵلاّ لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا ئەمەی راگەیاند کە جارێ ئەم بیرۆکانە بەتەواوی وڵاتانی رۆژئاوای نەگرتبووەوە,رێکخراوەکانی ژنان و بزوتنەوەکانیان دەستی پێنەکردبوو,بۆیە لەم روانگەیەوە نیارانیان قسەی بێ بنەمایان بۆ هەڵدەبەستن,بەتایبەتی بۆ خانمی زەڕین تاج چونکه پێشتر ئەم خانمە خاوەنی راستەقینەی یەکسانی مافەکانی ئافرەتانە لە سەردەمی (حەزرەتی باب) لە وڵاتی ئێران و دەکەوێتە بەر تیرو توانجی کۆمەڵگەکەی.

## سەرەنجام:

لە پاش لێبوونەوە لە خوێندنەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەگەینە چەند راستیەك لەوانە: بابییە بزاڤ و بیروباوەڕێکی ئایینی و

سیاسی گەڵ کۆنە و بە هۆی سەید عەلی محەمەدی شیرازی (باب) زیندوو کراوەتەوە ، لە ناوچەکانی ئێران و پەیوەندییەکی بە تۆڵی هەبووە بە بیروباوەڕی شەیخییەی شێخ ئەحمەدی ئەحسائی و پاشان پەلوپۆی هاویشتووەتە ناو خوارووی عێراق و بەغدا، شاروشارۆچکەکانی کوردستانی رۆژهەڵات بە تایبەتی کرماشان و دەوروبەری کە چەندین بیروباوەڕی ئاینە باتنی یەکانی تێدایە وەك ئەهلی هەق وعەلی ئیلاهی و زەردەشتی و پاشان پەلوپۆی هاویشتتووەتە یەك دوو شاری کوردستانی باشوور وەك کەرکەك و سلێمانی ، کە کاریگەری بیروباوەڕەکە بەسەر دانیشتوانی یاخود پیرەکانی ئەهلی هەق و هەقەکانی سەرگەڵوەوە بووە ، لە کاتی هاتنی (بەهائوڵلا) بۆ شارەزووروسلێمانی و چوونی بۆ تەکییەی خالیدییەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی شارەزوری و گیرسانەوەی بۆ ماوەی دوو ساڵ لەو دەڤەرەو بە تایبەتیش لە سەرگەڵو کە سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەدەن . هەروەها خاڵێکی تری گرنگی ئەم جۆرە جولانەوانە ئەویەو دەگەرێتەوە بۆ ئەو زوڵم و زۆرەی لە خەڵکان کراوە لە ناوچەیەکدا یاخود لە ولاتێکدا بە تایبەتیش کۆمەڵ و گرۆیانێك کە خاوەن بیروباوەڕی تایبەت بە خۆیان بوون لەو ولاتەو ناوچانەدا وەك گرۆی بابییە کە مێژوویان گەڵ کۆنترە لەم مێژووەی کە باس لە راپەڕینەکەیان دەکرێ، زیاتریش ئەم جۆرە بزوتنەوانە لە دژی ئومەوییان بەرپا بووە پاشان عەبباسییان چونکە مافی خەڵکانێکی زۆریان داگیر

کردبوو لەبەر ئەوەی عەرەب نەبوون هەرچەندە ئەم خەڵکانە بوونە موسڵمان یانیش ڕەنگو بۆی موسڵمانیان گرتبوو ، بۆ داماڵینی ئەم دەمامکەو هەناسە هەڵکێشان و گەڕانەوەی مافە زەوت کراوەکانیان ئەم شۆڕشانە بە ناو ئایینی و پەیدا بوونی مەهدی وخۆئالاًندنیان بەم چەمکەوە تین وگڕی زیاتر بەو کەسانە داوە کە بەشداری ئەو جۆرە بزاڤانا بوونە. هەمدیس بۆ چوونە جیاوازەکانی شیعەکان لە مەڕ ئیمام و ئیمامییەتەوە و چۆنیەتی ڕوانینیان سەبارەت بەم بابەتە هەستیارە چەندین گرۆی جیاجیاو بیرو هرزی دژ بە یەك پەیدا بوون و لەپشت ئەم قەیرانەیشەوە کۆمەڵە خەڵکانێك هەبوونە، توانیویانە سوود لەم هەلانە وەر بگرن بۆ دووبارە پەیدابوونەوەیان لەسەر شانۆی ڕووداوەکان کە پێشتر خاوەن ئایین و دەسەلاًت و بیروباوەڕی دوور لە شیعە و شیعەگەری بوون و، خاوەن تایبەت مەندێتی خۆیان، لە بارەکانی ڕۆشنبیری و کۆمەلاًیەتی و ئابووری لە دەست دابوو، یانیش بە هۆی فشارەوە سەربەست و ئازاد نەبوون ، بە هۆی ئەم جولاًنەوە ئایینی یانەوە توانیویانە هەندێ جار سەریان بەرز بکەنەوە ئەگەرچی دووچاری کوشتن وبڕین و ئەنفال کردن هاتبن، هەروەها لە ڕوداوەکانی ئەم جۆرە بزاڤەوە بۆمان دەردەکەوێ کە گرنگییەکی زۆر بە ئافرەت دراوە بۆ بەشداری کردن و دەربڕینی بیروڕای خۆی وەك مرۆڤێك بۆ بەدەست هێنانی بڕێك لە ئازادییەکانی ، هەروەها بۆ جۆش وخرۆشی

خستنه دڵی ئەو کەسانەی کە دەبوونە پێشمەرگەی ئەم بیروباوەڕانەو شان بە شانی یەکتر کاریان دەکرد بۆ گۆڕانکاری کردن لە ناو کۆمەڵگادا و نەهێشتنی دیاردە نارێك وناڕاستەکان کەزۆرجار پەیدا بوون بۆ کوێیلە کردنی خەڵك و سەرلێی شێواندنیان و دوورخستنەوەیان لە مافەکانی ژیان . تاقە چەکێکیش بە دەستی خەڵکانەوە بووبێ ، ئایین و بیروباوەڕی ئایینی بووە کە بتوانن لەم ڕێگایەوە دەست بە جموجووڵ و سەرهەڵدان بکەن خۆیان بخزێننە ناو ئەو جۆرە شۆرشە ئایینی یانە هەرچەندە لە ڕواڵەتدا شۆڕشەکان ئایینی بوونە.

**سەرچاوە و پەراوێزەکان:**

١ – سەلام عەبدولکەریم عەبدوڵڵا، بزوتنەوەی شعوبیەت لە مێژووی ئیسلامدا، وەزارەتی رۆشنبیری، بەڕێوبەرێتی گشتی چاپ و بلاْوکردنەوە .

٢ – الدکتور جمیل صلیبا، المعجم الفلسفي بالالفاظ العربیة والفرنسیة والانکلیزیة واللاتینیة ،ج/١ ، مطبعة دار الکتاب اللبناني ، بیروت ١٩٧٨ ص ٢٠ – ٢٣ .

٣- ضاری محمد الحیاني، البهائیه حقیقتها واهدافها، مطبعة دار العربیه، بغداد ١٩٨٩ ص ٢٧.

٤- سەرومر عەبدولرەحمان، ئیمامی دوازدەهەم (مەهدی) لە بیری ئاینی سیاسی شیعەی ئیمامیدا، گۆڤاری سەنتەری. لێکوڵینەوەی ستراتیجی کوردستان دۆسێی ئیسلام ل ٧

٥– هەمان سەرچاوەی پێشوو، المعجم الفلسفي جمیل صلیبا ص ٤٤

٦– الدکتور عادل عوا ، منتخبات اسماعیلیة ، مطبعة الجامعة السوریة دمشق، س ١٩٥٨، بروانە پێشەکی کتێبەکەی.

٧– توفیق وەهبی، چەند لاپەڕەیەکی دەسنووسی تایبەت کە پاش کۆچ کردنی کەوتە دەستم و لام پارێزراوە.

٨- الدكتور. محمد مفيد آل ياسين ، الحياة الفكرية في العراق في القرن السابع الهجري، الطبعة الاولى ، الدار العربية للطباعة ، بغداد ١٩٧٩ ص ١٧ — ٢١ .

٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕەکانی ٣٢ — ٣٣ .

١٠- پرۆفیسۆر E. J. ئەسلەمونت ، بهاء الله و دوری نوی ، وەرگێڕانی م . جودت بغداد ، چاپخانەی مەعاریف ١٩٣٣ ، ل ١٩

١١- البهائيه وحقيقتها واهدافها ص ٣٦.

١٢- الدكتور علي الوردي، لمحات اجتماعية من تأريخ العراق الحديث، الجزء الثانى، مطبعة الارشاد، بغداد س ١٩٧١ ص ١٣٤ — ١٣٧

١٣- المحامى عباس العزاوى ، تأريخ العراق بين احتلالين ، الجزء السابع ، شركه التجاره المحدوده بغداد س ١٩٥٥ ، ص ٧٢.

١٤- رشيد الخيون، الاديان و المذاهب بالعراق، منشورات لسان الصدق ط ٢٠٠٥ ص٢٥٢ و ص٢٥٦

١٥- الاعلمي ، العلامة الحاج الشيخ محمد حسين الاعلمى الحائرى، من اعلام القرن الرابع عشر المتوفي سنة ١٣٩٣ ه ، دائرة المعارف، مطبعة دار التعارف بيروت لبنان ١٩٥٩ ، ج/ ١٣ /ص١٢.

١٦- عبدالحميد العلوضي ، الباطنية وتياراتها التخريبية ، دار الشؤون الثقافية العامة بغداد ١٩٨٩ ص ٢١٢.

١٧- بڕوانه دائرة المعارف الاعلمی، ج/١٣/ ص/١٨

١٨- بهاءالله و دوری نوی، ل ٢٣ ، ٢٤

١٩- دائره المعارف الاعلمی ج/١٣ ص ١٣ و ١٤.

٢٠- بهاءالله و دوری نوی ، ل ٢٤ ،٢٥

٢١- بڕوانه دائرة المعارف الاعلمی ، ج/١٣ ص١٨

٢٢- بڕوانه دائرة المعارف الاعلمی ، ج/١٣ ص١٥

٢٣- بهاءالله و دوری نوی ، ل٢٥ هەروەها دائرة المعارف الاعلمی، ج/١٣ ص١٥

٢٤- دائرة المعارف الاعلمی ، ج/ ١٣ص١٦

٢٥- الدكتور علي الوردي ،لمحات اجتماعية من تأريخ العراق الحديث ، الجزء الثانى الفصل الخامس ،ص ١٥٢ ئەم بەشەم كورت كردوەتەوە وەك سەرچاوەيەكی سەرەكی وەرم گرتووە ، هەروەها بڕوانە عەباس عەزاوی العراق بين احتلالين ج/٧ ص ٧٢

٢٦- درايڤەرو كورد، كۆمەڵەی پێنج وتار، وەرگێرانی ئەنوەری سوڵتانی چاپخانەی شڤان سلێمانی.

٢٧- سەبارەت بە سێدارەدانی عەلی محەمەدی شیرازی، درايڤەر بە هەڵدا چووە ناوی تیرەی شقاقی هێناوە. بەڵكو راستيەكەی لە لايەن پۆلێكی سەربازی(ئەرمەنی) يەكانەوە درايە بەر گوللە

هەروەكو لەم نووسینەدا باسم كردوە. بەڵام ئەنوەری سوڵتانی كە وەرگێـری ئـەم كتێبــەی درایڤــەرە لــە پــەراوێزی ژمــارە(١٢)دا نووســیویە: بابیــەكان فیرقەیــەكی ئــایینی – سیاســی بــە بــیرو بۆچــوونی پێــشكەوتن خــوازەوە بــوون و دژ بــە زولــم و زۆری سیستەمی حكومەتی قاجارەكان خەباتیان دەكرد، دژایەتی كردنـی بابیــەكان لەگــەڵ پێداویــستی دەزگــای روحانییەكانــدا، بــووە هــۆی یەككرتنی مەلایانی شیعە لەگەڵ دەرباری قاجاڕی و فەتوای ئەم و سوپای ئەو پێكەوە، ڕیشەی پەیرەوانی بابیـان دەرهێنـا، پاشمـاوەی بابیەكان واتە بەهاییەكان گەرچی لـە بـارەی ئایینـەوە خۆیـان بـە درێژەی ئایینی باب دەزانن، بـەڵام لـە بـاری هەڵوێـستی سیاسـیەوە گــەلێك لــە عەدالــەت خــوازانی بــابی جیــاوازن. دوای چــەند كوشتارێكی گشتی لـە سـەردەمی ناسـرەدین شـای قاجـاردا(١٨٤٨ تـا ١٨٩٦). لە بابیەكان كرا، ژمارەیەكی زۆریان لێكوژرا، دوا سـەنگەری بابیەكان قەڵای (چەهریق) بـوو لـە دەورو پـشتی سـەلماس – ئـەو شـوێنەی دواتـر لـە بزوتنـەوەی سمكـۆی مەزنـدا شـوێنایەتیەكی گرنگی پەیدا كرد، هێزی دەوڵەتی ئێـران بـە سـەرۆكایەتی(عـەزیز خــانی ســەردار مــوكری)، ((ســردار كــل)) ی ســوپای ئێــران لــە سەردەمی ناصرەدین شادا، كـە خـۆی كـورد بـوو خـەڵكی ناوچـەی موكریــان بــوو، قــەڵای چــەهریقیان لــە بابیــەكان گــرت و تــا دوا

کەسـیان لێکوشـتن. بروانـه ل ١١٩ درایڤـەرو کـورد پـەراوێزی ژمارە(١٢) .

٢٨- درایڤەرو کورد، وەرگیرانی ئەنوەری سوڵتانی ل ٩٧ - ٩٨

٢٩– محمد علي سلطاني، ایلات و طوایف کرمانشاهان، جلد /٢، تهران س ١٣٧٢ ، لاپەڕەکانی ٦٢٨ و ٩٠٧.

٣٠. الحدیقه الناصریه فی تاریخ و جغرافیا کردستان، علی اکبر کردستانی ، ترجمه جان دوست، دار اراس للطباعة والنشر اربیل ٢٠٠٢ ص ١٤٤ الی ١٤٨.

٣١- هەمان سەرچاوەی پێشوو ص ١٩٤.

٣٢- دائرة المعارف الاعلمی ، ج/١٣ ص٢٣ — ٢٤

٣٣- بهاءالله و دوری نوی ، ل٢٧

٣٤- هەمان سەرچاوە ، ل ٢٧

٣٥- دائرة المعارف الاعلمی ، ج/١٣ ص١٣

٣٦– دائرة المعارف الاعلمی ، ج/١٣ ص١٣

٣٧ -- ضاری محمد الحیانی، البهائیه حقیقتها واهدافها.

٣٨- دائرة المعارف الاعلمی ، ج/٤ ص٩٧

٣٩- دائرة المعارف الاعلمی ، ج/٤ ص٩٧

٤٠- دائـرة المعـارف الاعلمـى ، ج/٤ ص٩٩ هـەروەها تەماشـاى لمحـات اجتماعية ، ج/٢ ص ٢٠٤ بكە

٤١– الباطنية و تياراتها التخريبية ، ص ٢١٧

٤٢- لمحات اجتماعية من تأريخ العراق الحديث ج/٢ ص/ ٢٠ و ٢٢.

٤٣- هەمان سەرچاوە لاپەڕە ( ٢٠٤ ) ج/٢

٤٤– العراق بين احتلالين ، ج/٧ ص ٧٤

٤٥- دائرة المعارف الاعلمى ، ج/٤ ص٩٩

٤٦- عەبـدولرەقيب يوسـف، گۆڤـارى رامـان ژ ( ١١١ ) ئـابى ٢٠٠٦ ل ١٦٧

٤٧- لمحات اجتماعية من تأريخ العراق الحديث ج/٢ ص/ ٢٠٤ و ٢٠٥

٤٨– مـستەفا عەسـكەرى ، ئاوردانەوەيـەك لـە بزوتنـەوەى هەقـە، چاپخانەى علا ء ، بغداد س ١٩٨٣ ، ل ٦٧

٤٩- العراق بين احتلالين ، ج/٧ ص ٧٤

٥٠-- بهاءالله و دورى نوى ، ل٣٨

٥١- لمحات اجتماعية ج/٢ ص ٢٢٥ و٢٢٦

٥٢- هەمان سەرچاوە ، ص ٢٢٤ هەروەها بهاءالله و دەورى نوى، ل٥٢

٥٣- – بهاء ا لله و دةورى نوى ، ل٣٢

٥٤– دائرة المعارف الاعلمى، ج/٤ ص٩٩ – ١٠٠

٥٥- محەمەد مێرگە سوری، روژنامـەی چاودێر ژ (١١٤) دو شـەممە ٢٠٠٧/٣/١٣ بەهائیەکان، پێناسە، بیروباوەر، بەشی یەکەم..
٥٦- هەمان سەرچاوە، بەشی دووەم ژ (١١٥) دوو شەممە ٢٠٠٧/٣/١٩.
٥٧- لە ماڵپەری w w w islam web com
٥٨- روژنامـەی چـاودێر ژ (١١٥) هـەروەها ماڵپـەری www said net
٥٩- البهائية حقيقتها واهدافها ص ١٤٢ و١٤٣.
٦٠- لە ماڵپەری www gsur com
٦١- البهائية حقيقتها ص ١٤٠.

**سەرچاوەکان:**

١ – سەلام عەبدولکەریم عەبدوڵلا ، بزوتنەوەی شعوبیەت لە مێژووی ئیسلامدا، وەزارەتی رۆشنبیری، بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بلاوکردنەوە.
٢ - – الدكتور جميل صليبا، المعجم الفلسفى بالالفاظ العربية والفرنسية والانكليزية واللاتينية ،ج/١ ، مطبعة دار الكتاب اللبنانى ، بيروت ١٩٧٨.
٣ - – الدكتور عادل عوا ، منتخبات اسماعيلية، مطبعة الجامعة السورية دمشق ١٩٥٨.
٤ - – الدكتور . محمد مفيد آل ياسين ، الحياة الفكرية في العراق في القرن السابع الهجري ، الطبعة الاولى ، الدار العربية للطباعة ، بغداد ١٩٧٩ .
٥ - پرۆفیسۆر E. J. ئەسلەمونت ، بهاء الله و دەورەی نوێ ، وەرگێڕانی م . جودت ، چاپخانەی مەعارف بغداد ١٩٣٢.
٦ - الدكتور علي الوردي ،لمحات اجتماعية من تأريخ العراق الحديث، الجزء الثانى ،مطبعة الارشاد ، بغداد ١٩٧١.
٧ – المحامى عباس العزاوى ، تأريخ العراق بين احتلالين، الجزء السابع ، شركه التجاره المحدوده بغداد ١٩٥٥.
٨ -– الاعلمي، العلامة الحاج الشيخ محمد حسين الاعلمى الحائرى، من اعلام القرن الرابع عشر المتوفي سنة ١٣٩٣ هـ ، دائرة المعارف، مطبعة دار التعارف ج/ ١٣ ، ج/ ٤ بيروت لبنان ١٩٥٩.
٩ - عبدالحميد العلوضي ، الباطنية وتياراتها التخريبية، دار الشؤون الثقافية العامة بغداد ١٩٨٩.

١٠ - — محمد على سلطاني، ايلات و طوايف كرمانشاهان ،جلد /٢ ، تهران ١٣٧٢

١١ - — مستەفا عەسكەری ، ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە ، چاپخانەی علاء، بغداد ١٩٨٣

١٢ – توفیق وەهبی، چەند لاپەڕەیەكی دەسنووس

١٣- ضاری محمد الحیانی، البهائیة حقیقتها واهدافها مطبعة دار العربیة بغداد ١٩٨٩.

١٤- گۆڤاری سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیژی كوردستان. دۆسێی ئیسلام.

١٥- رشید خیون، الادیان والمذاهب بالعراق منشورات لسان الصدق ط ٢٠٠٥.

١٦- درایڤەرو كورد، كۆمەڵەی پێنج وتار، وەرگێرانی ئەنوەری سوڵتانی چابخانەی شڤان، سلێمانی.

١٧- علی اكبر كردستانی، الحدیقة الناصریة فی تاریخ و جغرافیا كردستان ترجمة جان دوست دار اراس للطباعة والنشر اربیل ٢٠٠٢.

١٨- عەبدولرەقیب یوسف، گۆڤاری رامان ژ (١١١) ئاب ٢٠٠٦.

١٩- هەفتەنامەی چاودێر ژمارەكانی (١١٤) و(١١٥) س ٢٠٠٧..

٢٠- ئەمیر فەرهەنگ ئیمانی، بەهائوڵلاّ لە كوردستان، وەگێڕانی:دڵشاد كەریم-ئاسۆ,چاپخانەی روون-سلێمانی,س ٢٠١٠.



مشرق اذکار روسیا



لەحیای کارمەلدا مەرقەدی حضرەتی باب وعبدالبها



ئەشکەوتی باوەدین (بهاءالله) لە سەرگەلوو
لەگەڵ پێنج کەس لە بەهائییەکانی بەغدا - ٢٠٠٥/٥/٢٧



ئەشکەنجەدانی بەهائییەکان



يحيى النوري الملقب بـ(صبحي أزل) عاش (1831-1912م)



جبل سركلو في السليمانية بكردستان العراق الذي اعتكف فيه حضرة بهاء الله مدة سنتين قمريتين (1270-1272هـ) (أبريل 1854-مارس1856م) و عرف به باسم درويش محمد في وقت كان الرئيس الصوري للجامعة البابية يحيى أزل قد أقدم على سلسلة من الأعمال المشينة بمعونة من سيد محمد الإصفهاني التي أدت إلى انقسام الجامعة البابية و انحطاط أحوالها.



صورة نادرة لميرزا يحيى أزل زعيم البيانيين الأزليين مع بعض أفراد عائلته في قبرص في السنوات الأخيرة من حياته.

